# سروه

ئەدەبی فەرهەنگی



٥١
رەزبەری
١٣٦٩



ناوەندی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ وئەدەبی کوردی
ئینتشاراتی سەلاحەدینی ئەییووبی

گۆڤاری فەرهەنگی - ئەدەبی سروە، ساڵی شەشەم ژمارە ٥١ رەزبەری ١٣٦٩ - نرخ ٢٠ تمەن

# «گازە»

سەیدکامیلی ئیمامی «ئاوات»

رووڕەشی دەرگای خودام و سەرگەندەی مستەفا

شەرمەساری رۆژی حەشرو مل کەچی ئالی عەبا

چارەڕەش، شەو تا بەیانی، هەرزەم و ئەولا دەکەم

هەروەکوو ماری برینداری، هەڵدەسووڕێم بێ سەدا

رووڵەکوێ کەم یارەبی چبکەم لەدەس عیسیانی زۆر

غەیری دەرگای تۆینە، دەرگێ کەرەحمم پێ بکا

دێمە دەرگاکەت کە بۆچاکت و خراپ ئاوالەیە

کەدڵ و پۆستم رادەخەم، تاهەم لەدنیای بێوەفا

هەرئەوەندەم بەس، کەتۆم ناسیو، لەتۆداوادەکەم

لێم ببووری و خۆش ببی لێم و نەپرسێی لێم جەزا،

رووم رەشە، ئەمما سەرورێشم وەکوو بەفری سپی

بەو سەرورێشم ببەخشە نەک بەرووی هێندە سیا

«کامیل» ەنێوم بەڵام ناقیس لەدونیا مامەوە

چونکە بێمەیلی ئەتۆم زۆرکردەوە تاتوانیم خودا

# نێوەرۆک





ڕووبەرگ:
دیاری - عومەر باپیری- بۆکان



پشت بەرگ:
حەسەن قودرەتی - بۆکان



## سەروتار

**بەناوی خودا**

**(لەمەزرایەکدا کەتۆپیان دەچەقاند شووتیمان لێوە دەکرد):**

لەژمارەی ڕابردوودا باس کێشایە ئێرە کە پاش دەسپێکردنی شەڕی داسەپاوی عێراق لە دژی ئێران و بەتایبەتی پاش دەرکەوتنی هێزی دەشکان نەهاتووی کەلی ڕاپەڕیوی ئێمە، پیلانکەلی سیاسی تازە دەستی پێکرد تاهەرچی دەکرێ عێراق و ڕۆژاوا زۆرتر لێك نزیك بکاتەوە. ئەمریکا داڕێژەری سەرەکی پیلانی شەڕکە لەبنەوە هەمووجۆرە یارمەتی ولایەنگری یەکی لەعێراق دەکرد ناچار بە شێوەیەکی ئاشکرا دەستی لە هەلۆیستی بێ لایەنی خۆی هەلگرت وبەئاشکرا پشتیوانی لەرژیمی بەغدا دەست پێکرد. هەست بەمەترسی لە لایەن شوڕشی کەورەی خەلکی وئیدئۆلۆژیکی ئێران وەها تەنیەوە کە جەبهەی عێراقی دەوشەڕەدا بەکردەوە ئەمریکا وشووڕەوی و ولاتە عەرەبی-یەکان. بەتایبەتی ئەوانەی مەلبەندی کەنداوی فارسی ڕەکەلکەوت وهەروەك کوتمان پیلان وکە لالە دارشتنی ئەمریکا پێویستی بەنزیکی زۆرترهەبوو. حا وڵەونموونانەی ژێرەوەکەن.

سەددام لە وتوویژێك دادەگەڵ كۆڤاری ئەمریكایی تایم رێكەوتی **۶۱/۴/۲۳** دا دەڵێ:

" ئەمن خۆم دژایەتی یەكەم دەگەڵ ئەمریكانیە. ئێمە پێمان خۆشە دەگەڵ ئەمریكا پێوەندی دۆستانەمان هەبێ".

رادیۆئەمریكا :

"كاربەدەستانی ئەمریكایی لەمەڕ* دەڕۆن كە ئەمریكا لەلایەن عەرەبستان وئۆردۆنەوە زەختی كەوتۆتەسەر كە ناردنی چەك بۆ عێراق دەست پێ بكاتەوە وبەو چەشنە یارمەتی عێراق بدا لە شەڕەكەی دژ بە ئێران دا وبەواتەی ئەمكاربەدەستانە واشنگتن ملی بۆئەم داخوازیانە دانەواندووە.

رۆژنامەی واڵ ستریت ژۆرناڵ رێكەوتی **(۴ ژوئین۱۹۸۰)** دەنووسێ:

هەرچەند بەرواڵەت ئەمریكا بۆیارمەتی دانی عێراق بێ مەیلە بەڵام نیشانە گەلێك بەدەستەوەیە كە نیشان دەدا ئەمریكا بەنهێنی یارمەتی عێراق دەدا.

رۆژنامەی ئیسپانیایی ئیلپائیس:

ئەمریكا بە هۆی فرۆكەكانی خۆیەوە و هەواپەیما ئاواكسەكانی عەرەبستانەوە دەسا یەی پێكە و جێگەی هێزەكانی ئێراندایارمەتی عێراق دەدا.

سەرۆكی سەردەمی كۆمیتەی پێوەندی دەرەوەی مەجلیسی سێنای ئەمریكا لەرۆژنامەی [illegible] نەقڵ دەكا :

"ئەمریكا دەبێ [illegible] بە وڵاتانی كەنداو بفرۆشێ [illegible] ئێران بدا كە ئەم وڵاتانە چەك و چۆڵی خۆیان بە عێراق بفرۆشنەوە."

هێنری كیسینجێر لەمەقالەیەكدا كە لە واشینگتەن پۆستدا بڵاو بۆتەوە دەڵێ:

"ئەگەر عێراق شەڕەكەی بردبایەوە ئەمڕۆ دەكەنداودا ترس و نیگەرانیمان نەدەبوو. و سوود و قازانجی ئێمەش هێندە نەدەكەوتە ژێرمەترسی یەوە. بە هەرحاڵ بەرامبەری هێز دەو مەڵبەندەدا گەلێك گرینگە وبەسوودی ئێمەیە هەرچی زووترە ئاگربەسێك لەم ناوچەیە پێك بێنین."

فەرانسوا میتران سەرەك كۆماری فەرانسە **(رۆیتر۶۱/۹/۶)**

"هێزە رۆژاواییەكان نایانەوێ كەعێراق دە شەڕی ئێراندابشكێ."

كوانت، راوێژكەری ئەمنیەتی نەتەوەیی سەردەمی سەرەك كۆماری ئەمریكا دە وتوویژ دەگەڵ كۆڤاری "ئەلوەتەن"ی كوەیتی دا دەڵێ:

"پاش سەركەوتنەكانی كۆتایی ساڵی رابردوو. سیاسەتی بێ لایەنی ئەمریكا بە ئاشكرا ئاڵ وگۆڕی بەسەرداهاتووە." ئەم ئاڵ وگۆڕە بۆ لایەنگری لەعێراق بەفرۆشتنی ۶۰ فەروەند هیلی كۆپتێری شەڕ بەودەوڵەتە دەركەوتووە. ئەوە بێجگە لەوبەرنامەیە كەبایی ۴۵۰ میلیۆن دۆلار خواردەمەنی دەدابە عێراق كەلەساڵی **۱۹۸۵**ەوە تائێستا سابیقەی نەبووە.

جۆرج باڵ جێگری پێشووی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریكادەڵێ : (ئەمێریكەن ئەرەب ئەمیرزنووامبەر **۱۹۸۳**).

"...ئێمە دەبێ تا ئەو جێگایەی لەدەستمان دێ دەوڵەتە رۆژاواییەكان دنە بدەین تا بێ ئەوەی راستەوخۆ دەرگیرببن یارمەتی عێراق بدەن. بەرواڵەت لە سەرئەوەی كە ئەمریكا لەم بارەوە دەیكا زۆرقسە نەكراوە ونابێ زۆریشی قسەلەسەربكرێ."

رۆژنامەی واشینگتەن پۆست **۱۹۸۲/۱۲/۲۰**.

"تەنیا رێگەی بەرهەڵستی دەبەرامبەرسەركەوتنەكانی ئێران دەوشەڕەدا ، یەكیەتی وپاڵوێكدانی* ئەمریكا ووڵاتەكانی تری ئەندامی ناتۆدەگەڵ عێراقە. دەوبەستێنەدا پێشنیار ئەوەیە كە ئەمریكا دەپێشدا میسرو ئۆردۆن ودەوڵەتەكانی دیكەی ناوچە بۆ لایەنگری لە عێراق پشتیوانی بكاوتەیاریان* بكا. ئەوجارپێویستە ئەمریكا پلەی پێوەندی سیاسی خۆی دەگەڵ عێراق بەرێتە بان ،چون هەر دووك وڵات لەسەر ئەم بڕوایەن كە ئەو كارە بۆپاراستنی هێمنایەتی كەنداوی فارس پێویستە. سێهەم ئەوەیە دەبێ پێش بەسەركەوتنی ئێران دەم شەڕەدا بگیرێ ورێكایە-لەبۆكۆتایی هێنان بەشەڕبدۆزرێتەوە بێ ئەوەی ئێران هیچ سەركەوتنێكی وەدەست بكەوێ."

**بۆعێراق ؟**

پاش سەركەوتنی شۆڕشی ئیسلامی ئێران دەساڵی **۱۹۷۹** دا كە بوو بە هۆی زۆر ئاڵ و گۆڕی بنەڕەتی دەكێشە سیاسیەكاندا بەتایبەتی مەڵبەندی كەنداوی فارس و رۆژهەڵاتی نێوەراستدا -

رۆژاوا و رۆژهەلات بۆبەرەنگاری دەگەڵ ئەم جوولانەوە بەربلاوە پێشکەوتووە لەیەکدی نزیک بوونەوە وبۆ لەرێگا لادان یا تێکشکاندنی شۆرشی ئیسلامی بەیەك گەیشتن.یەکێك لەم بەرنامە-گەلە هێرشی عەسکەری وشەرکردن دەگەڵ ئێران بوو• هەڵبژاردنی عێراق بۆئەم کارپێ ئەسپاردنە زۆر دەلیلی هەبوو کە ئێمەگرینگ-ترینەکانی دەست نیشان دەکەین:

١- لەبەر ئەوەی شۆرشی ئێران دەزاتی خۆیدا دژبە رۆژاوابوو • ئەمریکا وهاودەستەکانی هەمیشە تاوانباری دژایەتی وپیلانگێران لە دژی گەل ومیری ئێران بوون • دیاربوو کە هەل و دەرفەتی هێرشی راستەوخۆ لەلایەن رۆژاواوە لەبەر ئەوەی گوتمان ولە بەردووری جوگرافیایی و لەدەستدانەبوونی کە رەسە وهەلی پێویست کاری کردنێ نەبوو• کەوابووهەڵبژاردنی عێراق بۆئەم دەورگێرانە لەلایەك بە هۆی رۆژاوایی نەبوون ولە لایەك بەهۆی نزیکی وجیرانەتی دەگەڵ ئێران زۆرمناسب بوو•

٢- ئینقیلابی ئێران هەوێنی دژایەتی ئەمپریالیمی تێدابوو • شەپۆلێکی بە خرۆش وکوڵ وجۆش بوو کە لەخەسڵەتی ئیدئۆلۆژیکەوە سەرچاوەی گرتبوو •ئەونیشانانە کارتێکردنێکی لە ئەنداز بەدەری پێدابوو• بە دەبەرچاوگرتنی ژماری زۆری ئەو کەسانەی گوێگری ئەم دیاردە سەرسورهێنەرەبوون هەر جوولانەوەیەکی ئاشکرا لەدژی ئەم شۆرشەگرێ ئاکری دژایەتی دەگەڵ ئەمپریالیمی بلێسە دارتر دەکرد- بەتایبەتی لەم ناوچەولە وڵاتە عەرەبی یەکاندا وشاسۆی سیاسی قازانجی رۆژاوای تاریك دەکرد • لە بەر ئەوە دەوڵەتی عێراق کەهێزی وڵاتانی گەلە کۆمەکی رۆژهەڵاتدا بوو• ناوبانگیشی بە دژایەتی دەگەڵ ئەمریکا وئیسرائیل رۆیشتبوو بەباشترین مۆرە بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە پێ سپێراوە- دەنا سرا • بێجگە لەوەش دوژمنانی بەشەر دەیانویست بەدەبەریەك راکردنی ئێران وعێراق وتەبلیغات کردن لەسەر دژایەتی ئەمریکا و ئیسرائیل دەگەڵ عێراق روخساری ئینقیلابی ئیسلامی ئێران کە ئالا هەڵگری خەبات دژی زوڵم و بێدادی دنیاخۆران بووناحەزبکەن وئەوبا وەرە لەنێوبەرن کە ئێران تەوەرەی خەباتی زۆرلێکراوە لە دژی چەوسانەوە وملهوڕیدا •

٣- هێرش بردن بۆسەروڵاتان کارێکی ناحەز ولۆمەکراوە ولە روانگەی بیروڕای گشتی جیهانی یەوە پەسند نەکراوە• بەڵگە ودەلیل دەدەست دابوون - هەرچەسد راستیش نەبێ - بۆدەست پێکردنی شەرپێویست بوو• لەمێژینەبوونی ناکۆکی نێوان ئێران وعێراق بیانووی چاك بوو• کاربەدەستانی ماف پێ شێل کەری عێراق ئەو بیانوویان بەدەستەوەبوو•

٤- بێجگە لەوقەقەرەباسکراوانە هێزوتوانای وڵاتی دەستدرێژکەریش گرینگ بوو کە لەم روانگەشەوە عێراق لەوڵاتەکانی دیکەی ناوچە ئامادەیی زۆرتری هەبوو •بەمجۆرە بوو کە عێراق هێرشی هێنا سەر سنوورەکان وبەشێکی لەوڵاتی ئێمە داگیرکرد• زۆری پێ نەچوو کە بلقی خەونووچکەی سەرکەوتنی عێراق تەقی ودەستدرێژکەرەکان تێگەیشتن کەئێرانی ئیسلامی پاڵپشتی جەماوەری خەڵکە و هەروا بەئاسانی تێك ناشکێ و لەوانە شە شکست ونوشست بە نسیب عێراق ببێ کە ئەوەش بۆ رۆژهەڵات ورۆژاوا ورژیمە دەستکردەکانیان فاجیعەیەك بوو • لەبەر ئەوە بە هەموو هێزیکەوەبۆ یارمەتی دانی عێراق هەستان و بۆدرێژەدانی جینایەت پێشکەوتە-ترین چەك و چۆڵی نیزامی یان ناردە عێراق بۆسەددام وهەرئەم لایەنگری بوو بە هۆی ئەوەکورگە خوێنخۆرەکەی بەغدا وەحشیانەترین رووداوی دژبە ئینسان لەکوردستان و جەبهەی دەرەوەداپێك بێنێ • دوژمنانی بەشەر هەوڵیان دا بە هەموو توانایانەوە نەهێڵن سەددام بکەوێ وئێران سەرکەوێ• ئەوان هەر چەند بەیانهێشت رژیمی بەعسی بۆکەن بکەوێ بەلام گورگێکیان دەباوەش خۆدا پەروەردەکردکە سەرەنجام هێرشی بردەسەر خۆیان • هێرشی عێراق بۆسەرکوێت زۆرشتی روونتر کرد ویەکێك لەوحەقیقەتانە هەرئەم راستی یەیە کە کاتێك مرۆڤدۆستی وسەرنجدان بەمافی مرۆڤ دەخرێتە پشت گوێ و دەستدرێژی بۆمافی دیتران بە مەباح دەناسرێ• سنوورەکان تێك دەشکێن وگورگە خوێنخۆرەکان یەکتر هەڵدەدڕن وکەس لەکەس ئەمی

نابێ٠

مەتلەبی دووهەم ئەوەیە کە هێزەکەورەکان ولەسەرووی هەموان ئەمریکا بەدەستدرێژی گەورەبوون و وبەدەستدرێژی کردن دەژین وتەنیا فکر لە دەستدرێژی دەکەنەوە٠ئەمرۆ کە دەبینین دەبەرامبەر دەستدرێژ ی دابۆسەرکوێت هەڵوێستیان گرتووە لە واقیعا لەبەرئەوەنیە کە دەکەڵ ئەسڵی دەستدرێژی بۆسەرمافی کەلان ناحاوێنە،بەڵکووئەم کارە ی عێراق بە دەستدرێژی بۆسەرسوود و قازانجی خۆیان دادەنێن،دەنا ئەوکاتی کە هەر ئەم رژیمە هێرشی هێنا سەرئێران کەس نەبوو عێراق بەدەست درێژکەربناسێ وچکۆلەترین هەڵویستی دژایەتی دەکەڵ ئەم رژیمە بکرێ٠

دێرەدا لەباسی دەستدرێژ ی راستەوخۆی ئەمریکا وشوورەوی بۆ سەرپاناما وگرانادا وئەفغانستان چاوپۆشی دەکەین٠٠٠ سەرنج دان بەو خاڵە پێویستە کە ئەمریکا و دیتران دەهەر هەل و مەرجێکدا تەنیا قازانجی خۆیان لەبەر چاوە ولەهەر هەلێك بۆپتەوکردنی دەسەلاتداری خۆیان کەڵك وەردەکرن٠

دەستدرێژی عێراق بۆسەرکوێت بیانووی داوەرووکانی هێزە ئەمریکی یەکانی دەناوچەدا پێك هێنا٠ بەزووترین کات هێزدکانیان لەناوچە داجێکربوون ٠ هەڵبەت پێویستە لەمەرداوەرووکانی نیزامی ئەمریکا لەناوچەداوبەرهەمی نالەبارو بە زەرەریدا بە جیاواز قسەبکرێ کە هیوادارین لە داهاتوودا ئەم باسە ورێکەی بەر بەرەکانی دەگەڵ ئەم داوەرووکانە بخرێتە ژێرباس ولێکۆڵینەوە٠

مەتلەبی سێهەم کە قەیرانی کوێت روونی کردەوە مەسەلەی میری یە ژێردەستەکان وخەڵکی ئەم وڵاتانەیە٠ ئەوەی کە لەیەکەم نیکادا دەبیندرێ بێ هێزی وبێ دەسەلاتی ئەم وڵاتانەیە کەناتوانن دەبەرامبەر چکۆلەترین قەیراندا رابوەستن وچکۆلەترین بەسترانەوە وپاڵپشتیان بە گەلەوە نیە٠

ئەم قەیرانەی دوایی لە لایەنی داکیرکردنی کوێت لە لایەن عێراقەوە وداوەرووکانی هێزە ئەمریکایی یەکان و٠٠٠( کە ناحەزی یەکەی لە داکیرکردنی کوێت لە لایەن هێزەکانی عێراقەوە زۆرترە) نیشانی دا کەئەم دەوڵەتانە بی بی جان خانەیکی پووچەڵ و بێ ناوەرۆکن وبێجگە لە رواڵەت شتێکی دیکەنین و دەسەلاتداری لەم چەشنە وڵاتانە دا لەسەربنایەك بەندە٠ ئەم ناراوەستاوی یەبەرهەمی فەساد و زوڵم وزۆری تاقمی دەسەلاتدارە ودوورکەوتنەوەی جەماوەری خەڵکە لەدەسەلاتداری وکاروباری سیاسی و کەوتنەژێر کارتێکردنی فەرهەنگی بێکانە و رەواجی شتی پووچەڵ ولارێ بوونی بیروباوەری کۆمەلایەتی و بێکانە بوون لە هەستی پاکی نەتەوایەتی وبیروهزری شۆڕشگێڕانە وزۆرشتی دیکەیە٠ تاڵاوایە ئەو دەوڵەت و نەتەوانە چارەنووسیان هەرتێك شکان وسەرشۆڕی یە٠

ئەم کەلانە واباشە هێندێك مەودای پڕشنکداری مێژووی خۆیان وەبیربێننەوە ولە ژیانی شۆڕشگێڕانەی کەلانی تر دەرس وەربکرن ٠ لەکورد دەرسی راوەستان و شەرەفی پیاوانە مردن فێرببن ولەئێرانی شۆڕشگێڕ دەرسی راوەستان دەبەرامبەر هێرشی بەربلاو ی دەسەلاتدارانی بەغدا و پاڵپەستۆی سیاسی وئابووری و نیزامی ئەمریکا وشوورەوی و هاودەستەکانی وەربکرن ولە وەزعی خۆیاندا ئاڵ وگۆرێك پێك بێنن٠

بیکومان لەم چەشنە حاکم و دەسەلاتدارانە کەوابەستە ونۆکەر سیفەتن٠ چاوەڕوانی راسان و هەڵووران وخۆهەڵبڕینەوەناکرێ ٠ تەنیا ئەوەی جێکای هیواوهومێدە بێداری کەلانە و کەڕانەوەیانە بۆ باوەشی فەرهەنگی ئایینی و ئینقیلابی خۆیان٠ ئەوەدەتوانێ ببێتە تەوەرەوبستی یەکیەتی قووڵ بۆدامەزراندنی نیزامێکی عادلانە ،سەربەخۆ،شۆڕشگێڕانە وپێشکەوتنخواز ٠ تەنیابەوکارە دەکرێ جێ پێی زلهێزەکان دەناوچەدا نەمێنێ وهەمووکەلانی عەرەب وتورك وفارس وکوردو٠٠٠٠٠ بتوانن بەسوڵح وئاشتی وبرایانە پێکەوەبژین و دەرێکەی سەرکەوتن وپێکەیشتن دا هەنکاوهەڵبکرن٠

خودائاگادارتان بێ




سرمقالە

**"از مزرعه‌ای که توپ کاشته میشود هندوانه برداشت میکردیم"**

**در شماره، گذشته بحث به اینجا رسید که پس از آغاز جنگ تحمیلی عراق علیه ایران و بویژه پس از اثبات شکست ناپذیری و انسجام روز افزون ملت بپا خاسته، ما، معادلات سیاسی جدید با هدف نزدیکی هر چه بیشتر عراق به غرب شکل گرفت و آمریکا طراح اصلی جنگ ناچار شد تا به حمایتهای همه جانبه، پنهانی خود بسنده نکرده و آشکارا از موضع به اصطلاح بی طرفی دست برداشته و بصورت علنی از رژیم بغداد حمایت نماید. احساس خطر از ناحیه، انقلاب بزرگ مردمی و ایدئولوژیک ایران آنچنان جدیت یافت که جبهه، عراقی جنگ عملاً به یک جبهه" بزرگ و گسترده و شامل تعداد زیادی از کشورهای غربی، کشورهای عربی بویژه در حوزه، خلیج فارس و شوروی گردید و هم چنان که گفتیم طراحی و مدیریت آمریکایی لزوم نزدیکی آشکار را نشان میداد، به این نمونه‌ها توجه کنید :**

**صدام در مجله، آمریکایی تایم مورخ ۶۱/۴/۲۲ :**

**من شخصاً " مخالفتی با ایالات متحده، آمریکا ندارم، ما مایلیم که با آمریکا روابط دوستانه داشته باشیم.**

**رادیو آمریکا : مقامهای آمریکایی افزوده‌اند که آمریکا از سوی عربستان سعودی و اردن تحت فشار قرار گرفته است تا تحریم ارسال جنگ افزار به عراق را لغو کرده و به آنها اجازه دهد به فرستادن جنگ افزارهای ساخت آمریکا به عراق آن کشور را در جنگ با ایران یاری دهند و به گفته، این مقامات، واشنگتن با این امر موافقت کرده است.**

**وال استریت ژورنال مورخ ۴- ژوئن ۱۹۸۰ :**

**با وجود عدم تمایل آمریکا به یاری علنی و آشکار به عراق نشانه‌هایی در دست است، که حاکی از کمکهای نظامی سری واشنگتن به عراقیهاست.**

**روزنامه، اسپانیایی الپائیس :**

آمریکا بوسیله، ماهواره‌ها و هواپیماهای آواکس مستقر در عربستان در مشخص مواضع نیروهای ایرانی به نیروهای عراقی کمک میکند.

رئیس وقت کمیته، روابط خارجی مجلس نمایندگان آمریکا به نقل از رویتر - :

آمریکا باید به کشورهای خلیج فارس اسلحه بفروشد و اجازه دهد که این کشورها سلاحهای خود را به عراق بفروشند.

هنری کسینجر طی مقاله‌ای در واشنگتن پست :

اگر عراق جنگ را برده بود امروز نگرانی و وحشت در خلیج نمیبود و منافع ما در منطقه آنقدر که اینک در خطر قرار دارد دچار مخاطره نمی‌بود. در هر حال با توجه به اهمیتی که توازن قوا در این منطقه دارد، این به نفع ماست که هر چه زودتر در این منطقه آتش بس بر قرار نمائیم.

فرانسوا میتران رئیس جمهور فرانسه : رویتر ۶۱/۹/۶

قدرتهای غربی نمی‌خواهند که عراق در جنگ با ایران شکست بخورد.

کوانت مشاور امنیت ملی وقت رئیس جمهور آمریکا در مصاحبه با مجله، کویتی الوطن :

پس از کسب یک سری پیروزی ایران بر علیه عراق که در اواخر سال گذشته صورت گرفت، تغییر جهت در سیاست بی طرفی آمریکا در زمینه، طرفداری از عراق آشکار شد. تغییر جهت در سیاست (حمایت آشکار از عراق) آمریکا در فروش اخیر ۶۰ فروند هلی کوپتر جنگنده به عراق نمایان گشت و این جدا از یک برنامه ۴۵۰ میلیون دلاری تهیه، مواد غذایی بود که از سال ۱۹۸۵ تا به حال سابقه نداشته است.

جرج بال معاون اسبق وزارت خارجه آمریکا : - آمریکن عرب افیرز نوامبر ۱۹۸۲ ...... ما تا سر حد امکان باید سایر دول غرب را تشویق نمائیم، تا بدون درگیری مستقیم به عراقیها کمک کنند. ظاهراً " در مورد آنچه که ایالات متحده در این مورد انجام میدهد زیاد صحبت [illegible] است و زیاد هم نباید در این مورد صحبت شود.

روزنامه، واشنگتن پست - ۱۹۸۲/۱۲/۹ :

تنها راه ایستادگی در برابر پیروزیهای ایران در این جنگ، اتحاد و هماهنگی رسمی آمریکا و دیگر کشورهای عضو ناتو با عراق است. در این زمینه پیشنهاد میشود که اولاً " آمریکا، مصر، اردن و دیگر کشورهای منطقه را برای کمک نظامی به عراق مورد پشتیبانی قرار داده و تجهیز کند. ثانیاً " آمریکا باید سطح روابط سیاسی خود با عراق را ارتقاء دهد. زیرا هر دو کشور معتقدند که چنین اقدامی برای حفظ امنیت خلیج فارس ضروری است. سوم اینکه باید جلوی پیروزیهای ایران را در این جنگ گرفت و راهی برای پایان جنگ پیدا کرد، بدون اینکه ایران هیچگونه پیروزی بدست آورد.

**چرا عراق ؟**

در پی پیروزی انقلاب اسلامی ایران در سال **۱۹۷۹** که منجر به تغییرات اساسی در معادلات سیاسی - بویژه در منطقه، خلیج فارس و خاورمیانه - شد غرب و شرق برای مقابله با این حرکت انقلابی ومردمی گسترده و بالنده به هم نزدیک شده و در طرح و اجرای سلسله اقداماتی بمنظور انحراف در مسیر و یا شکست انقلاب اسلامی به توافق رسیدند. از جمله، این برنامه‌ها، "حمله، نظامی و آغاز جنگ علیه ایران بود. انتخاب عراق برای این منظور بنا به دلایلی صورت گرفت که به اهم آنها اشاره میشود :

۱- بنا به ماهیت ضد غربی انقلاب ایران، آمریکا و متحدان بین‌المللی وی از نقطه‌نظر افکار جهانی، پیوسته متهم به توطئه علیه حکومت و مردم ایران بودند طبیعی بود که امکان حمله، نظامی گسترده و مستقیم از سوی غرب هم از این جهت و هم به خاطر فاصله جغرافیایی و فراهم نبودن امکانات عملی نبود. بنابراین انتخاب عراق، از یک سو به خاطر غیر غربی بودن و از سوی دیگر بدلیل نزدیکی و همسایگی با ایران، انتخاب مناسبی به نظر میرسد.

۲ - ماهیت ضد امپریالیستی انقلاب مردم ایران و موج فراگیر ناشی از خصلت ایدئولوژیک آن نفوذ فوق‌العاده‌ای به آن بخشید و با توجه به کثرت جوامع و افراد که علی‌القاعده مخاطبین این پدیده اعجاب انگیز قرن بودند، این احساس وجود داشت که هر گونه حرکت آشکار علیه انقلاب اسلامی، گرایشات ضد امپریالیستی را - به ویژه در منطقه و کشورهای عربی - بشدت افزایش داده و افق فضای سیاسی منطقه منافع غرب را تیره سازد. از این رو کشور عراق بدلیل قرار داشتن در بلوک شرق و شهرت به مخالفت با آمریکا و اسرائیل مناسبترین چهره برای انجام این ماموریت بود. علاوه بر این دشمنان بشریت در نظر داشتند تا با درگیر ساختن عراق با ایران و تبلیغات گسترده بر موضوع دشمنی اسرائیل و آمریکا با عراق، چهره انقلاب اسلامی را که پرچمدار مبارزه علیه ظلم و بیداد جهانخواران بود مخدوش ساخته و محوریت ایران در هماهنگی و همسویی و تمرکز در مبارزه، ملتهای مستضعف بویژه مردم کشورهای اسلامی علیه استثمار و استعمار را از بین ببرند.

**۳ - تهاجم هر کشور با هر ویژگی به کشوری دیگر امری ناپسند و مذموم و از نظر افکار جهانی غیر منطقی و محل سؤال است. از این دلیل - هر چند واهی - برای شروع جنگ اقل کاری بود که لازم به نظر میرسید. سابقه اختلافات بین ایران و عراق مستمسک خوبی بود تا حکمرانان بغداد تجاوز به ایران را به اصطلاح توجیه نمایند. و این ویژگی منحصراً " به عراق تعلق داشت.**

**۴ - علاوه بر موارد یاد شده، مسئله، توانایی کشور مهاجم نیز حائز اهمیت بود و از این نظر نیز عراق از دیگر کشورهای منطقه آمادگی بیشتری داشت. بدین ترتیب عراق برای به شکست کشانیدن انقلاب نوپای ایران اسلامی به مرزها هجوم برده و بخشی از خاک کشور را به اشغال در میاورد.**

زمان زیادی نمی‌گذرد که عراق و

# مرۆڤی مادی و مرۆڤی مەعنەوی

«محەمەد شەبستانی»



الحمد الله الذي نور الارض و السموات بطلوع شمس فخر الكائنات و الصلاة والسلام علی من صور باجمل الصفات و علی آله و اصحابه الذين اهتدوا بالبينات

ئینسانی ماددی هەمیشە بە دوای ئاواتە دەروونی یەکانیدا دەخولێتەوە و وەدواکارێك دەکەوێ کە تەنیا بەرهەم و پاداشی خێرا و دنیایی تێدا ببینێ . کات لە کات زیادتر هەوڵی لە دوو دەدا چونکە بێجگە لە ژیانی جهانی ماددە بە ژیانێکی دیکە باوەڕی نیە . هەر لە بەر ئەو مەبەستەیە کە لە هەموو سات و کاتی خۆی بیر دەکاتەوە . بێ ئاگا لەوەی کە کات و سات نامێنێتەوە . بەڵکوو وەك سانیە ژمێری ساعەت لە ڕێگای نەمان و تێدا چووندادەخولێتەوە . لە سەر هەر ڕێگایەکی ئاوات و ئارەزووەکانیدا گورگی تەماع و نائومێدی و کەوتن لە چاڵاوی نەفامی خۆی مەڵاس داوە . ئەو ئینسانە ماددی یە هەمیشە لە ناو دەریای نائومێدی و خەم و پەرێشانی و پەشیمانی مەلە دەکا و هەر چەندە بۆ تێر کردنی ئاوات و ئارەزووەکانی کۆشش بکا زیادتر تینوو و سپڵە دەبێ .

ئەو هیوای بە پاشە ڕۆژ نیە و تاوانبارە بە مەرگ و لە ناو چوون بەڵام کەنگێ ؟ چۆن و لە کوێ ؟ نازانێ . ئەو هەمیشە لە نیگەرانی و ناخۆشیدا کات بە سەر دەبا و بیرو باوی ئاڵۆ زاو و خاشێنی لاواز و سست و سەرگەردان لە نێوان ئاوات و ئامانجی جۆراوجۆر و دژی یەکدایە . دەرمانی ئارام دەری دەروون نازانێ و سەرئەنجام بە مەرگ و لە ناو چوونی هەموو شتێك کۆتایی پێ دێ و بەرەو عەزابی پڕ لە ئێشی ئازاری خوداوە وەرێ دەکەوێ .

بەڵام ئینسانی باوەڕدار و موسوڵمان ئینسانێکە لە گەڵ ڕووکاری دەروونی جیاواز و ڕەوشت و بیر کردنەوەیەکی دیکەی هەیە . ئەو دەزانێ کە تام و خۆشی جهانی ماددییەت لە ناو چوونداییە و پشت بەستن بەو تام و خۆشی یە کارێکی نابەجێ یە و بێجگە لە ڕێبازێکی کاتی و ماڵێکی وەختی شتێکی تر نیە و ئامانج و ئاوات لە ڕێگادایە و ژیانی ئەم دنیایە بۆ تێپەڕ بوون بەو ڕێگایەدا دیاری کراوە ، بۆ گەیشتن بە مەبەستی سەرەکی کە پلە و پایەیەکی نەبڕاوەیەکە ئەویش وەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوایە . تە نیا پەروەردگارە دادوەر و یاریدەدەری هەموو مەرز و ئەندازەیەك . بێجگە لە خوا کەسی دیکە نیە .

ئینسانی باوەڕدار ئیمانی دامەزراوە لە سەر ئەوە کە ئەگەر هەموو ئادەمیزادی جیهان کۆ ببنەوە و ببانهەوێ زیانێکی پێ بگەیەنن ناتوانن چووکترین دەست درێژی بۆ لا بکەن بێجگە لە یاسا و بەرنامەیەك کە پەروەردگار لە کورەی زەویدادایڕشتووە ناتوانن کارێك بکەن . ئەو مرۆڤە ئیماندارە بە لاوازی دوژمن لە بەرابەر یاساکانی یەزدانیدا ئاگادارە . و بە سەرکەوتنی بێ چەند وچۆن لە هەوڵ و کۆششدا کە خاست و بەرنامەی یەزدانە دڵنیا و

ئاواته خوازه . ئەو دوباره باوەڕی وایه که ئەگەر تەواوی ئادەمیزادی سەر گۆی زەوی کۆ ببنەوه بۆ قازانج گەیاندن به ئەو بێجگه له رێگەیەك که خودای گەوره داینا‌وه دەستیان کورته و ناتوانن قازانجێك بگەیەنن . و هەر له بەر ئەوەیه که ئەو شتەی وەدەستی دەکەوێ ئەوەندەی پێ خۆشحاڵ نابێ که خۆی له بیر بچێتەوه . ئەوەی له دەستی دەدا بۆی نابێته هۆی خەم و پەژاره . چونکه خوای مەزنی ئەو مرۆڤە باوەڕداره ئاوا دەفەرموێ :

**ما اصابمن مصیبة فی الارض و لا فی انفسکم الافی کتاب من قبل ان نبراء ها ان ذالك علی الله یسیر لکیلا تاسوا علی مافاتکم و لا تفرحوا بما اتیکم و الله لا یحب کل مختال فخور .**

سوورەی حەدید ٢١ و ٢٢

واته : نایەت هیچ موسیبەتێك له موسیبەتان نه له زەوی و نه له‌بوونی‌خۆتاندا مەگەر ئەوه نەبێ که له قورئاندا گوتراوه پێش ئەوه که ئێمه خۆمانی لێ به دوور بگرین . چونکه به راستی هاتن و رۆیشتنی بەڵا و موسیبەت له دەست خوا زۆر ئاسانه بۆ خاتری ئەوه که ئێوه وەدووی شتێك نەکەون که به زایەتتان* داوه . خۆشحاڵ نەبن به شتێك که دراوه به ئێوه له ماڵ و سامان چونکه ئەمه تەنیا تاقی کاری یه له لایەن خوایەوه وه خواش ئینسانی خۆ بەزۆر گری خۆش ناوێ که وابێ خۆتان به شێوەیەك بار بێنن که بۆ خۆتان و خوا و خەڵك بەکار بێن .

هەر کاتێك رووداوێك به پێچەوانەی ئارەزووی ئینسانی موسوڵمان روودەدات ئاوا به خۆی دەڵێ :

**و عسی ان تکرهوا شیئا " و هو خیر لکم و عسی ان تحبوا شیئا" و هو خیر لکم و الله یعلم و انتم لا تعلمون .**

بەقەره ـ ٢١٦

واته : نزیکه ئێوه شتێکتان پێ ناخۆش بێ که کەلکی بۆ ئێوه هەیه و به پێچەوانه شتێکتان پێ ناخۆش بێ، بەڵام له راستیدا زیانی بۆ ئێوه هەیه چونکه خوا دەزانێ بەڵام ئێوه نازانن .



ئەو باوەڕداره خوای گەوره بەزانا و دادپەروەر و خاوەنی رەحمەت دەزانێ . که کارەسات و گۆڕانگاری یەکانی جیهانی له سەر بنەڕەتی زانایی و بەرژەوەندی* دروست کردووه .

مرۆڤی خاوەن باوەڕ هەموو کاتێ له هەوڵ و تێکۆشاندایه له رێبازی گەیشتن به ئامانج که بەرز کردنەوەی ئاڵای ئیسلامه . به هەنگاونانی بێ پشوودان به پێشوازی مەرگ دەڕوا و شێرانه دەڵێ : **" اینما تکونوایدرککم الموت ولو کنتم فی بروج مشیدة "** ـ نساء ٧٧

له هەر کوێ یەك بن مردنتان دەگاتێ جا با له قەڵای زۆر دژوار و سەختیشدا بن چونکه مردن ئەمری خوایه و جگه له ئەو هەموو گیاندارێك دەیچێژێ.دوباره بیر خۆی دێنێتەوه که خوای تەعالا دەفەرموێ : **" قل ان الموت الذی تفرون منه فانه ملاقیکم "**

جمعه ـ ٨

دوباره دڵی خۆی به فەرمووده‌ی‌خوا ئاو دەدا که دەفەرموێ: ( **و ما کان لنفس ان تموت الا باذن الله کتابا " موء جلا"** )

عمران ـ ١٤٥

واته : نیه هیچ گیانێك که دەر بچێ له لاشه ، مەگەر به فەرمانی خوا نەبێ ، چونکه دەرچوونی هەموو گیانێك

نووسراوه و کاتی بۆ دیاری کراوه ·

پیاوی بڕوادار له گەڵ خەڵکدا دوو روونیه و تەماع بە کەس نیە.لە پشتەوە خەنجەر لە کەس نادا · بەڵکووهەموو کاتی ژیانی خۆی لە گەڵ خەڵکدا تێپەڕ دەکا · کە خەڵکیش بێ ئاگا و نەزان بێ دڵسوزانە و کارا*مانە ئەو خەڵکە لە گێژاوی نەزانی رزگار دەکا · چونکە ئەو ئینسانە لە دەروون و ویژدان خۆیدا ئەو پەیامەی خوای گوێ لێ بە کە دەفەرموێ : " **ادع الی سبیل ربك بالحكمة و الموعظة الحسنة** "·

نەحل ـ ١٢۶

واتە : بانگ بکە بۆ سەر رێبازی خوای خۆت بە کار جوانی و بە دوانی جوان و بە کەلك و لێزانانە ·

ئەو جاریش وەك جاری پێشوو ئەو فەرمانەی خوا دێنێتەوە بیر کە دەفەرموێ : " **والموء منو ن و الموء منات بعضهم اولیاء بعض یا ءمرون بالمعروف وینهون عن المنكر** " ·

توبە ـ ٧٢

یانی بازێك لە بڕواداران سەرپەرستی بازێکی تر دەکەن بە وە کە خوا دەفەرموێ: " **و الذین معه اشداء علی الکفار رحماء بینهم** · " واتە : ئەوانەی کە بە بیرو باوەڕ لە گەڵ محەمەد دان توندن لە سەر کافران ، بە روحم و بە زەیین لە نێو خۆیاندا ·

لاو و کەنج و پیری موسەڵلەح بە بیرو باوەڕی راستی دەسەڵاتدارانی ستەمگەری کافر و بێ بڕوایان لە بەر چاو پووچ و بێ ناوەرۆکن و وەك بڵقی سەر ئاو لە ناو دەچن · چونکە مرۆڤی موسوڵمان هێز و دەسەڵاتی بێ ئەندازە تەنیا لە خوا دەزانێ · ئەو خوایەی کە خۆشەویستە،دەسەڵاتدارە ،گەورەیە زانایە · موسوڵمان باوەڕی وایە کە ئەگەر لە رێگای راستی و مرۆڤایەتیدا سەعی و کۆشش بکا بە پشتیوانی یەزدانی جەببار بە سەر زۆرداران و خوێنمژاندا سەر دەکەوێ · خاوەن ئیمان لێی یەقین و ئاشکرایە کە مانەوەی زۆرداران و زاڵمان لە رێڕەوی سروشت و مێژوودا وەختێکی کەمی هەیە و تەنیا مۆڵەت دانێکی خوایی یە کە ئەوی هێشتۆتەوە ، بەڵام ئەو زۆردارەش بێ ئاگایە لەوە کە لە دەستی خۆی گۆڕی ئاورینی بۆ خۆی هەڵدەکەنێ ·

لە راستیدا هێزە زۆردارەکان ناتوانن مرۆڤی باوەڕدار بکەنە دیل و بەندەی خۆیان · ئیماندار وا بیر دەکاتەوە کەهەر لە بەر ئەوەیە کە خوا دەفەرموێ: " **لا یغرنك تقلب**



**الذین کفروا فی البلاد متاع قلیل ثم ماء واهم جهنم و بئس المعاد** " ـ عمران ـ یا دەفەرموێ: " **انما نملی لهم لیزداد انما** " ـ عمران ـ١٧٨

یانی ئێمە مۆڵەتی زۆر دار دەدەین تا گوناه زۆر بکا یا بیری ئەوە دەکا : " **ایحسبون انما نمدهم به من المال و البنین نسارغ لهم فی الخیرات بل لا یشعرون** " ـ موء من ٥٥ و ٥۶

ئەوەش وەبیر دێنێتەوە کە خوای زیلجەلالدەفەرموێ: " **و لن یجعل الله للكافرین علی الموء منین سبیلا** " ـ بە راستی خوای تەعا لا داینە ناوە بۆ بی بڕوایان لە سەر بڕوادان هیچ بەڵگە و دەلیلێك · ئالێرەدایە کە باوەڕداران لەو ئایەتە پیرۆزانە ئارامی وەردەگرن و ئیرادەیان پۆڵادین و بە هێز دەبێ بە هیچ جۆرێك رێگە نادەن کە خەم و نیگەرانی و سستی وکۆ*ی لە واندا بەدی بکرێ ·

**والسلام علی من اتبع الحق والهدی** ·



# حافز ناسی

« محەمەد عەلی سەیفی قازی »

**هرگز نمیرد آنکه دلش زنده شد به عشق**
**ثبت است بر جریدهء عالم دوام ما ( ١ )**

بۆ لێکدانەوەی حاڵەت و بیروباوەڕ و بۆ چوونی حافز هەرکەس لەرێگایەکەوە لایەنێك یا خۆ چەند لایەنی خستۆتە بەرباس و لەسەری دواوە ٠یەکێك حاڵە تی دنیا بە فشەگرتن ، دەم رابواردن و یا بە زمانێکی تر بیرو بڕوای خەییامی حافزی لەبەرچاو گرتووە و گەورەی کردۆتەوە ٠ بۆسەلماندنی ئەم فیکرەش بەڵگە دێنێتەوە ٠ وەك :

**خیز و درکاسهء سر آب طربناك انداز**
**پیشتر زانکه شود کاسهء سر خاك انداز ( ٢ )**

یا لە جێگایەکی دیکە دا هێزی حیکمەت لە بەرامبەر رازی خیلقەتدا بە ناتەوان دەزانێ وڕێگای فەلسەفە بەناوسانە و مەکر دادەنێ ٠ لە جێگایە -

کاك فاڕووق کەیخوسرەوی لە فارسی یەوە کردوویە بە کوردی

کیشدا دەڵێ :

**سپهر برشده پرویز نی است خون افشان**
**که ریزەاش سرکسری و تاج پرویز است ( ٣ )**

زۆر بەڵگەی دیکەش دێنێتەوە کە هێنانیان لێرەدا ناگونجێ ٠

ئەڵبەت لەوەیدا کە دەبێ لەهەموو لایەنێکەوە باس لەسەر حافز و شێعری حافز بکرێ قسەیەکمان نیە ٠ هەروەك لە شێعرەکان و بیروبڕوای حافزڕا بۆمان دەر دەکەوێ ، ئەم کەڵە پیاوەی شێعرو ئەدەبی فارسی موثا لایەکی قووڵ و وردی بوزە و نەك هەر دوور نیە بەڵکوو دیار و ئاشکرایە کە رێباز و فەلسەفەی خەییامی ناسیوە و نەزم و کەلامی خەییام سەرنجی ئەویان راکێشاوە و کاریان تێ کردووە ٠

سەبارەت بە ئەسڵی دنیا بەفشەگرتنیش ، هیچ گومان لەوە دانیە کە تەئسیری لەخەییام وەرگرتووە ٠ بەلام ئەو تەئسیرەی دەگەڵ فیکری رەخنەگر و هەستی ناسکی خۆی ئاوێتە کردووە ، دوای پالاوتنی لە مێشکی خۆیدا کردوویە بە تان و پۆیەکی هاوریشمی بۆ چنین و دارشتنی رستەی جوانتر و دڵڕفێنتر بەوشەی نوێ تر و تەعبیری تازە دا هێنراوترەوە کە لە شێعری حافزدا خۆدە نوێنن ٠

(١) ئەوانەی دڵیان زیندووی ئەوین بێ هەتاهەتایە نامرن بەڵکەی مانەوەمان لەدەفتەری زەماندا مۆرکراوە

(٢) هەستە بەر لەوەی کاسەی سەر ببێتە خاك ئەنداز ئاوێکی خۆشی هێنەری تێ رژێنە ٠

(٣) ئەو ئاسمانە لەو سەرەوە بێژنکێکە خوێنی لێدەتکێ ئەوەی لێی دەرژێ سەری کەسرا وتاجی پەرویزە ( کە پادشای ساسانی بوون )

ئەوەی کە شیعری خواجەی حافز زیاتر لە شیعری خەییام جوێ دەکاتەوە ئەوەیە کە لەو رۆژگارە تاریکە دا تۆوی هیوا دەچێنێ و بەداسی مانگی نوێ گوڵی ئاوات دەدروێ :

**ببر زخلق وزعنقا قیاس کار بگیر**
**کصیت گوشه نشینان زقاف تاقاف است ( ۴ )**

یاخۆ :

**خوش آن ساعت که استغنای مستی**
**فراغت بخشد از شاه و وزیرم ( ۵ )**

بەراستی ئەو وشە و رستانەی کە لەشانی کەسانێکی تر زیاد ین لە ئاست حافزدا بێ رەنگ دەبن وشیاوی ناوی بەرزی حافزنین . حافز مەنشوورێکە کە هەرکەس دەتوانێ رەنگ و تیشکی دڵخوازی خۆی تێدا ببینێتەوە .

هێندێك کەس حافز لە رێزی مەلامەتییەکاندا (۶ ) دادەنێن و ئەو شێعرانەی کە دەگەڵ خووخدەی خۆی یەك ناگرنەوە بەبەڵگەی ئەم بۆ چوونە دەزانن :

**دوش از مسجد سوی میخانه آمد پیرما**
**چیست یاران طریقت بعداز این تدبیرما( ۷ )**

یا :

**سرخدا که عارف سالك بکس نگفت**
**درحیرتم کباده فروش ازکجا شنید ( ۸ )**

یا :

**راز درون پرده زرندان مست پرس**
**کاین حال نیست زاهد عالیمقام را( ۹ )**

دەستەیەکی تر بەهێنانەوەی بەڵگە هێندێك شێعر و حاڵەتی حافز دەبەنەوە سەر ریشەی دینداری ومەسەلەی شافیعی بوون و ئەشعەری بوونی ئەو دەخەنە بەر باس . ئەشعەری یەکان باوەڕیان بە جەبر هەیە و چەند پلەی ( ۹ ) بۆ دادەنێن .

**گناه اگرچه نبود اختیار ما حافظ**
**تو در طریق ادب کوش گو گناه منست ( ۱۰ )**

یا :

**مرا بمرندی و عشق آن فضول عیب کند**
**که اعتراض براسرار علم غیب کند( ۱۱ )**

یا :

**نصیحت گوی رندانرا کبا حکم خدا جنگست**
**دلش بس تنگ می بینم مگر ساغر نمیگیرد( ۱۲ )**

یا :

**درپس آینه طوطی صفتم داشته اند**
**آنچه استاد ازل گفت بگو می گویم( ۱۳ )**
**.... هتد**

یا :

**من کطوحی سادەام هر نقش راآماده ام .**
**دست نقاشان قدرت تا چه تصویرم کنند( ۱۴ )**

مەسەلەیەکی تر عارف بوونی حافز و باوەڕی ئەو لەتەسەووفە ، کە بۆ خۆی باسێکی بەربڵاوە . ئایا ئیشراقی بووە یامەشائی یاحاڵەتێکی نێوان ئەم

---

(۴) لەخەڵك بپڕەوە و چاو لە عەنقا بکە وکاری ئەورە چاوبکە ناوبانگی گوشەنشینان لەم سەری دنیا بۆئەوسەر رۆیشتووە .

(۵) خۆزگە بەو دەمەی کە بێ نیازی حاڵەتی مەستی وام لێدەکا کە ئاگام لەشاو لەوەزیر نامێنێ .

(۶)مەلامەتی دەستەیەك لەسۆفی یەکان بوون کە بەنهێنی نوێژ و تاعەتیان دەکرد بەڵام بەروالەت خۆیان بەپێچەوانە نیشان دەدا و دەیانگوت خودا باشتر لە خەڵك ئاگای لەکردەوەی ئێمانە . کەوایە دەبێ لە خەڵوەتدا باشتر لەو کاتەی کەخەڵك ئاگادارە رەفتار بکرێ .

(۷) دوێ شەو پیرەکەمان لەمزگەوتەوە هاتە مەیخانە ئەرێ یارانی رێ لەمەودوا چارەمان چییە ؟

(۸) ئەسراری خوا کە عارفی سالك بەکەسی نەگوتبوو سەرم سوڕ دەمێنێ مەی فرۆش چۆنی بیستبوو

(۹) ئەسراری پشتەوەی پەردە لەو قەلەندەرە مەستانە بپرسە چونکوو زاهیدی پایە بەرز حەوسەڵەی ئەم کارەی نیە

(۹) حەوت پلەی جەبر

(۱۰) هەر چەند گوناە بە ئیختیاری خۆمان نەبووە حافز تۆ بە ئەدەب بە و بڵێ گوناهی منە

(۱۱) ئەو فرووڵە ئیرادی ئەوین و قەلەندەریم لێ دەگرێ لەراستی دا ئیراد لە ئەسراری عیلمی غەیب دەگرێ

(۱۲) ئەوەی پەندی قەلەندەر دادەدا دەگەڵ حوکمی خودا بەشەڕ دێ ئەگەر بۆخۆی پیاڵە وەرناگرێ کەوا دڵتەنگی دەبینم

(۱۳) لەبەرانبەر ئاوێنەدا وەك تووتی رایانگرتووم هەرچی مامۆستای رۆژی بەرین بڵێ هەرئەوە دەڵێمەوە

(۱۴) شێعری حاجی میرزا حەبیبوڵڵا موجتەهیدی مەشهەدی یەکە حەکیمێکی ئیشراقی بە . بەمانای ئەمن پەردەیەکی سپیم ئامادەم هەرنەخشێکم لەسەر بکێشرێتەوە . داخوا وێنەکەری دەسەڵاتدار

دەو رێبازە یاهیچ کامیان بەڵکوو رێبازێکی نوێ تـــر و جوانتر کە تەنیا تایبەت بەحافز بووە ؟ ئـایـــــا ئەویش وەك مەولانا پێی ئیستید لالی یەکانی بەچێوین وبێ تەمکین زانیوە وئیشراقی کلاسیکی شێخـــــی ئیشراق ( شیخ شەهابەددینی سوهرە وەردی ) یاکـــورد گوتەنی " سوورەبەردی " وسەنایی و عەتتـــــاری هەڵبژاردووە و سەیر و سلووکێکی گرتۆتە بەر کە بـــۆ گەیشتن بە بەقاو توانەوە ( فانی بوون ) لەودا حـەوت پلە دەبێ بپێـوری ؟

**هفـت شهر عشق را عطار گشـــــت**
**مـا هنـوز انـدر خـم یـك کـوچـه ایـــم ( ١٥ )**

بلێی مەقاماتی سەیر وسلووك ( گەڕان لـــە دووی حەقیقەت و هەوڵدان بۆ پێ گەیشتن ) و ... خۆش ویستن " کەئەویش حاڵەتێکە لە دیتنی جوانی لـــە روانگەی سالیکەوە لەلایەن حافزەوە قەبووڵ کرابێ ؟ بلێی حافز گەیشتن بە مەعریفەتی تەواو یا تـەئسیـــر وەرگرتن لە فەلسەفەی ئەفلاتوون و بیروباوەڕی نـــوێ ئەفلاتوونی یەکان وەك " فلووتین " ی قەبووڵ کردبـــێ کەجگە لەزوهدی بەکردەوە بناخەیەکی زانستـــــی و نەزەریشی هەیە ؟ بلێی تەزکیەی نەفس و دووری لــە هەوای نەفسانی و خۆراهێنان بە چوارفەزیلـەتی (١٦) بۆگەیشتن بەکەماڵ بەپێویست زانیبێ ؟ رەنگ بـــێ لەم شێعرانە دا مەبەستی ئەوەبێ :

**سالها دل طلب جام جم از ما می‌کـــرد**
**و آنچه خود داشت زبیگانه تمنا می کـرد**
**گوهری کز صدف کون و مکان بیـرون بـــود**
**طلب از گم شدگان لب دریـا مـی کـرد**
**بیدلـی درهمـه احـوال خدا بـا او بـــود**
**او نمیدیدش و از دور خدایـا مـی کـــرد ( ١٧ )**
**( هتد ) .**

هێندێك کەس وادەزانن کە حافز " هەمووخودایی" یا " پانتە ئیستی" بووە وخودای لەهەمووجێگایەك و لە هەموو شتێکدا دیوە :

**مـادر پیـالـه عکس رخ یـار دیـده ایـــم**
**ای بی خبر زلذت شرب مـــدام مـــا ( ١٨ )**

یانی لەراستیدا ویستوویە پردێك لێ بدا کە لـــە رێگای مەعشووقی خاکی یەوە خۆی بگەیـەنێتـــە مەعبوودی ئەفلاکی و بەفەوتاندنی " من منـــــی " لەکیسرەتەوە بەوەحدەت بگا وخۆی بگەیەنێتە سەر چاوەی هەتا هەتایی بوون .

هێندێکیش لەم روانگەوە بۆی دەچن کـــە حافــز تێگەیشتنێکی قووڵی لە حەقایق بووە و لایەنی گشتـــی و ئەوەندە قووڵی داوە بە شێعرەکانی کە جیهانـــی هەستی ومرۆڤایەتی داگرتووە . هەربۆیەش بۆتە جامـی دنیانوێن وئاوێنەی بالانوێنی ئاوات و ئارەزووی هەموو ئینسانێك . هەر کەس بەشێوەیەك خۆی لە حافــزدا دەبینێتەوە و کەلامی ئەو بەراگەیەنەری هەســت و سۆزی دەروونی خۆی و چارەسەرکەری هەموو چەشنـــە گیرو گرفتێکی کۆمەڵایەتی دەزانێ . لەراستیشـــدا دیاردەیەك نیە حافز دەگەڵی بێگانە بووبێ و بـــێ سەرنج دان بە قەراغی داتێ پەڕیبێ ، بێ ئـــەوەی بەشی خۆی لێ وەرگرتبێ . مەکتەبێك نیە کە حافــز شاگردی نەکردبێ و بەهرەی لێ وەرنەگرتبێ .

لەناسینی حافزدا ئەوەندە لایەنی جۆراوجـــۆری بەربڵاو و لەهەمان کاتیشدا ئەوەندە ناتەبایی دەبینرێ کە لەلایەکەوە بە عەیا فرێدەرێکی کافر ناوی دەبەن کە بە تاقی تەنێ لە بەرانبەر زوهد فرۆشەکـــان و کەللە ویشکەکاندا رادەوەستێ (١٩) و لەلایەکەوە بـــە مەلەکووتی و لاهووتی دێتە بەرچاو ، کە دیوانەکـــەی دەگەڵ قورئان وسەحیفەی سەججادیە سەنگ و ســـووك دەکرێ . ( ٢٠ )

بەکورتی بلێین ئەم بوتە عەیارە هەرکاتەی بـــە شێوەیەك خۆدەنوێنێ و جیلوە دەفرۆشێ . کێیە ئـەم

---

(١٥) حەوت شار بە حەوت ولاتی ئەویندا گەڕاوە کەچی ئێمە هێشتا لە پێچی یەکەم کۆڵانداین
(١٦) پاکی و عەدالەت و ئازایی و حیکمەت
(١٧) چەندین ساڵ بوو دڵ ، جامی جەمی لە ئێمە دەویست شتێکی کە بۆخۆی هەیبوو لە بێگانەی دەویست لەوون بووەکانی قەراغی دەریا گەوهەرێکی دەویست کە لەکەون ومەکاندا دەست نەدەکەوت سەوداسەرێك کە هەمووکات خودای دەگەڵ بوو ، نەیدەدیت وهەرهاواری خودای دەکرد
(١٨) ئێمە وێنەی دیمەنی یارمان لە پیاڵەدا دیوە ئۆ بێ خەبەری لە چێژی خواردنەوەی ئێمە

دیاردە ئالۆزەی هەمووِ عەسر وزەمانەیەك ؟ کێ یە ئەم ئوقیانوسە بێ بنە ، ئەم شۆڕە سوارە بێ هاوتای مەیدانی عیرفان و ئیشراق ، ئەم ئینسانە پڕ لە ئەسرارو قووڵە کەهەرکەسەی لە روانگەیەکەوە دەیبینێ وهەڵی دەسەنگێنێ ودەلیل و بەڵگە لەسەری دێنێتەوە ؟

ئاغای حوسێن عەلی مەللاح بەمووسیقا زانێکی دەنگ خۆشی دەزانێ • ئاغای موهەندیس غەزنی ( ۲۱ ) لەروانگەی ئەستێرە ناسی یەوە تێیی دەڕوانێ و لە کەهکەشان بەدوایدادەگەڕێ • ئاغای دوکتۆر خانلەری بە عەیبیاری دادەنێ • بێ بەڵگەش قسەناکا و لە کەلامی حافز دەلیل و بەڵگە دێنێتەوە •

سائیبی تەبریزی شاعیری گەورەی ئێران بەسەر شیرینی و جوانی شێعری خۆیدا کەئاوا باسی دەکا :

**صائب کسی به رتبه ٔ شعرم نمیرسد**
**دست سخن گرفتم و برآسمان شدم ( ۲۲ )**

کاتێك باسی خواجەی شیراز دێتە گۆڕێ ، لەبەرامبەر لووتکەی بەرزی ئەدەبی ئێرانداکرنێش دەبا ، وەك شاگردێك لە بەرانبەر مامۆستاکەیدا کەلەراستیشدا لە جێگای خۆیەتی وواقیعەتی بەیان کردووە :

**هلاك حسن خداداد او شوم که سراپا**
**چو شعر حافظ شیراز انتخاب نداد ( ۲۳ )**

حافز جەزبە و سەرگەشتەیی مەولانا ، زمانی پاراوی سەعدی ، فەلسەفەی قووڵی خەییام و خاوێنی شێعری فیردەوسی دەخاتە سەر یەك ودیاردەیەکی سێحراوی پڕلە ئەسرار و نەبینراو وەك غەزەلی حافز دەخولقێنێ • کەلامی حافز گولاوێکی مەستی هێنەرە کەلەگولستانی بەرین و پڕ لە گوڵی شێعری فارسی گیراوە •

حافز لە شێعرەکانی دا جگە لە لایەنی عاتیفی ، ئینسانی و ئەدەبی ، گەنجینەیەکی پڕبایەخی لە هەموودین وئوستوورەکانی کە لانی جیهان لەکەلێنە فەرامۆش کراوەکانی مێژوو دەرکێشاوەو لە غەزەلە دڵنشینەکانی خۆی ئاخنیوە • ئەو پەیام هێنەرە • ئەو دەڵێ ئەگەر عیسا ( د • خ ) موعجیزەی کردووە رووحە- لقودس بە هانایە وە هاتووە ، دەنا منیش دەمتوانی شان لەشانی بدەم • لەئادەم تووڕە دەبێ کە بۆچی بۆتە هۆی سووکایەتی و ئەوی لە عەرشەوە هێناوەتە سەر فەرش •

**من ملك بودم و فردوس برین جایم بود**
**آدم آورد درین دیر خراب آباد م ( ۲۴ )**

واش قسەدەکا کە دەڵێی رۆژی بەرین* لەوێ بووە و بەچاوی خۆی عەهدو پەیمانی باری تەعا لا دەگەڵ مەخلووقاتی دیوە • ئەو بەچەکی ئەوینەوە دەچێتە مەیدانی فریشتەکان و لەبەر نەبوونی ئاوا چەکێك ئەوان لۆمەدەکا وخۆی لەوان لە بەرزتر وزیاتر دادەنێ • " بابەتی گرینگ لە روانگەی منەوە "

**گرچه فقرآلود دردم شرم باد از همتم**
**گر به آب چشمه خورشید دامن ترکنم ( ۲۵ )**

کەلامی حافز موعجیزەیە و موعجیزەی کەلامیشی ئەوینە • ئەوین وقەلەندەری و ئینساندۆستی و بەرهەڵستی یەکی بێ ئەم لاو ئەو لا دەگەڵ دووڕوویی وریا•

**طفیل هستی عشقند آدمی و پری**
**ارادتی بنما تا سعادتی ببری (۲۶)**

کەوابێ بێهوودە نیە کە کەسانی وەك " گۆتە " بۆی شێت دەبن و هەزاران مورید و ئەویندار لە سەرتاسەری دنیا پەیدا دەکا •

گۆتە بە عەشقی حافز دیوانی شەرقی غەربی دادەنێ و بۆ ئەوەی زیاتر دەحافز بگا زمانی فارسی فێردەبێ • " تاگوور " زانا و عارف وسیاسەتمەداری مەزن خۆی بەموریدی حافز دەزانێ وبۆزیارەتی مەرقەدەکەی لە هیندەوە دێتە ئێران •

---

(۱۹) ئەحمەدی شاملو (۲۰) ئایەتوڵڵا موتەهەری
(۲۱) "سیراختران دردیوان حافظ" ئاغای سەرفەرازی غەزنی
(۲۲) سائیب هیچ کەس ناگاتە پلەی شێعرەکانم دەستی نەزمم گرتووە و گەیشتوومە ئاسمان
(۲۳) لەبەرانبەر چاکە خوا پێداوەکانی دا بەفیداچم کە وەك شێعری حافزی شیرازی هەڵبژاردەی نیە •
(۲۴) ئەمن مەلایکە بووم وجێگام لە بەهەشتدا بوو کەچی ئادەم منی هێنایە سەر ئەم کاولە دنیایە
(۲۵) هەرچەند هەژار و دەردەدارم ، ئەوەندە بڵێند هیممەتم شەرم دەمگرێ
بەئاوی کانیاوی خۆر داوێنی خۆم تەڕ بکەم
(۲۶) ئادەم و پەری هەردوو لاخۆری خوانی ئەوینن خلووسی خۆت دەرخە تابە خۆشبەختی بگەی

" ئەنگەلس " بناخەدانەری ماتریالیسم لەنامەیەکدا بۆ " مارکس " هەواڵی کەشفی تازەی خۆی دەداتێ و لە دیاردەیەکی وەك حافز باس دەکا ٠ ئەو لە سەروبەندی بناخەدانان و تێکۆشان بۆناساندنی قوتابخانە فەلسەفی‌یەکەی خۆیدا ، بەسەر هەموو گیروگرفتەکانیدا دەست دەکا بەفێربوونی زمانی فارسی ، بەڵکووبتوانێ بۆ ناسینی ئەسراری جیهان لە خواجەی شیرازیارمەتی وەربگرێ و تا لاوی زاری خۆی بەشیرینی قسەی حافز خۆش بکا ٠ دوور نیە لەم رێگایەوە شوێن پێی دیالکتیك و ناتەبایی شی هەڵگرتبێ ٠ ئەولە مارکس داوادەکا فارسی فێربێ ولەم نیعمەتە بێ بەش نەبێ(٢٧)

" کلسۆم کەلیم ئۆڤا " لەتاجیکستان بەوەرگێران و لێکدانەوەی ٢٥ غەزەلی حافز دەرەجەی دوکتۆرا وەر - دەگرێ و شانازی بەوە دەکا کەتوانیویەتی لەم ئوقیانووسە بێ بنە لاوێچێکی وەربگرێ ٠

" ئێدوارد براون " ویکتۆر هۆگۆ "سێدارروۆدبێنکۆ' و زۆری تر لە موریدەکانی حافزن ٠

زشعر دلکش حافظ کسی بود آگاه
که لطف طبع و سخن گفتن دری داند(٢٨ )

لەو بڕوایە دام کەئیلهام دەری " شاندرێ ژید " لە " نیعمەتی زەمینی " ( ٢٩ ) دا خواجەی شیرازبووە ؤناتاناتێل"هەر ساقی یەکەی حافزە ، چونکوو ئەو ئاگرەی قەت دانامرێتەوە هەتاهەتایە لەدڵی حافزدا بلێسە دەستێنێ ٠

جا ئەم ئینسانە مەزنە بە دەست زاهیدە دوودینەکان و سۆفی یە ریاکارە بێ دینەکانەوە تاچ رادەیەك رەنجی کێشاوە و خۆی خواردۆتەوە ، دەبێ لێی ورد بینەوە ٠ هەرچەند ئەم جەماعەتە ریاکارە تۆمەتی بێدینی یان لێ دەدا ، بەڵام قەت کۆڵی نەدا و لەدەربڕینی راستی نەپرینگاوەتەوە ٠ ئەمیش وەك مەنسوور کە لەرێگای راگەیاندنی حەقیقەت و لە قاو دانی ئەسراری نهێنیدا گیانی خۆی بەخت کرد ، قەت بەوە رازی نەبوو قوفڵی دڵی دابخا و بوێرانە ئەسراری نهێنی ئەو کەسانەی دەدرکاند کەدوور لە چاوی خەڵك شتی وا دەکەن کە دەگەڵ فتوای خۆیاندا یەك ناگرێتەوە ٠ حافز لەم بڕوایە دایە کەئەگەر هەموو کەس لەمەحەك بدرێن ، سەومیعەدارەکان دەبێ سەریان دابخەن و شەرم بیانگرێ ئەو لەم مەیدانەدا تاقەسوارێکە کە هەرگیز نابەزێ و خۆبەدەستەوە نادا ٠

شتێکی ترکە سەروداڵی حافزی قەلەندەر دەگرێ حکوومەتی دەستەیەکی نەفام و تێنەگەیشتووە کە بە زۆرە ملی دەسەلاتیان بەدەستەوە گرتووە و ئەوەی نابێ بیکەن دەیکەن و هەزاران خانووی تێك رووخاو و چاوی گریان بەجێ دێڵن ٠ بەدیتنی ئەم دیمەنانە دڵی خواجە دێتەجۆش و لە هێندێك لە شێعرەکانی دا بەرەو جەبر دەڕوا ٠ ئەو پەلاماری چەنگیز و هولاکۆی بیستووە و تەیموورەشەل و ئەمیر موبارێزی بە چاوی خۆی دیوە کە چ بەلایەکیان بەسەر خەڵك و شارستانیەتی ئەو رۆژگارەدا هێناوە و چ زەبرێکی کاریگەریان لەکۆمەڵی مرۆڤایەتی وەشاندووە ٠ جێنایەت ئەوەندە سامناك بووە کە دوای ئەم هێرش و سووتمان وەدەست درێژییانە پێی سەیرە کە هێشتا بۆنی گوڵ و رەنگی سەمەنی نەفەوتاون ٠ بەلام ئەم مل هوڕیانە ناتوانن ئیرادەی پۆلایینی حافز تێك بشکێنن و هاواری ئەو کە زمانی یەکگرتووی هەموو ئینسانێکی زۆر لێکراو و رەنجەڕۆی مێژووی ژیانی ئادەمیزادە لە گەروودا بخنکێنن ٠

هەر ئەم کۆڵنەدەری و نەبەزی یەی حافز هانی دەداکە بێباك لە هیچ مەترسی یەك بەشیرێکی دوو دەمەوە دەگەڵ زوڵم و ریا بەشەڕ بێ ٠ ئەوهەرگیز سەربۆئەمیر موبارێزە ندین دانانەوێنێ ٠ هەر ئەو ئەمیرموبارێزەی کەکووپە دەشکێنی و ئالای بەربەرەکانی دەگەڵ فەسادی بەدەستەوە ، کەچی بۆخوی موفسیدێکی بێوێنە و سەرچاوەی فەسادە ٠ حافز لە هەموو شێعرەکانیدا بەناوی موحتەسیب باسی دەکا و لەقاوی دەدا ٠ رادە - گەیەنێ کە نابێ خیرقەپۆشی ئەم جۆرە کەسانە بەنیشانەی دینداری دابنرێ ، بەڵکوو خیرقەی وا سەدعەیبی شاراوەی لەبندایە و دەبێ بسووتێندرێ ٠

ئەگەر حافز بەچاکە باسی ئەبوو ئیسحاقی ئینجو و یا شاەشوجاع دەکا مەدح نیە چونکوو ئەوانە ئەدەب

(٢٧) بیردوەری یەکانی سەفەرەکانی دوکتۆر خانلەری بۆموسکۆ مجلد آینده سال ١٣٦٤ شماره های ٦ ، ٧ ، ص ٤٨٢

(٢٨) کەسێك لە شێعرە دڵنشینەکانی حافز تێدەگا کە تەبعێکی بەهەستی بێ وزمانی دەری بزانێ

(٢٩) مائدە زمینی

بڕوانە لاپەڕەی ٣٧

## پاشماوەی سەروتار

حامیان بین‌المللی آن از رویای شکست زود رس ایران بیرون آمده و بلکه بزودی در می‌یابند که نه‌تنها ایران متکی بر بسیج توده‌ها ، از پای در نمی‌آید بلکه چه بسا سر انجام این تهاجم . شکست عراق باشد که این خود فاجعه‌ای بس بزرگ برای غرب و شرق و رژیمهای دست نشانده در منطقه بود . از این رو با تمام توان به حمایت آشکار از رژیم بغداد بر میخیزند و برای ادامه جنایت و تجاوز پیشرفته‌ترین امکانات نظامی و مدرنترین تجهیزات جنگی را در اختیار صدام گذاشته و رژیم ضد بشری بعثی را تا دندان مسلح میکنند این حمایتها موجب میشود تا رژیم بغداد هم در جبهه، خارجی و هم در کردستان دست به وحشیانه‌ترین اقدامات ضد انسانی زده و بزرگترین فاجعه‌ها را ببار آورد . دشمنان بشریت باتمام‌توان کوشیدند تا مانع از سقوط صدام و پیروزی ایران شوند . آنان هر چند سر انجام مانع‌از سقوط رژیم بعثی شدند لکن گرگی را در جانه پروردند که در نهایت به منافع خودشان حمله برد .

تهاجم عراق به کویت بسیاری ازحقایق روشن‌را روشنتر ساخت . یکی از این حقایق همین اصل است که وقتی انسانیت و توجه به حقوق انسانها نادیده گرفته میشود و تجاوز به حقوق دیگران - برای دستیابی به منافع‌بیشتر - مجاز شمرده میشود . مرزها در هم میشکند و چه بسا گرگهای خونخوار یکدیگر را میدرند و متجاوزین و همدستان متجاوزین از تجاوز در امان نخواهند بود . مطلب دوم این که قدرتهای بزرگ و در راس همه آمریکا با تجاوز " قدرت بزرگ " شده‌اند و با تجاوز زندگی میکنند و جز به تجاوز نمی‌اندیشند و امروز که متفقا " در برابر تجاوز عراق به کویت موضع‌گرفته‌اند و متجاوز را محکوم میکنند ، در واقع نه از سر مخالفت با اصل تجاوز به حقوق ملتهاست که چنین میکنند ، بلکه این‌تجاوز را مستقیما " تجاوز" به منافع‌خود میدانند و گرنه آن هنگام که همین رژیم به ایران حمله برد . کسی نبود تا عراق‌را متجاوز خوانده و کمترین موضع مخالفتی در برابر این رژیم اتخاذ کند ، و البته صرف نظر کرده‌ایم از تجاوزات مستقیم آمریکا و شوروی و ... به پاناما ، گرانادا ، افغانستان و ...

توجه به این نکته لازم است که آمریکا و دیگران تحت هر شرایطی به منافع‌خود می‌اندیشند و از هر فرصت به دست آمده در جهت سلطه هر چه بیشتر بهره می‌جویند . تجاوز عراق به کویت موجب شد تا زمینه برای حضور فیزیکی آمریکا درمنطقه فراهم گردد و خیلی زود نوطئه، استقرار نیروها و تجهیزات نظامی آنها در منطقه جامه، عمل پوشید. البته لازم است در باره، حضور نظامی آمریکا در منطقه و اثرات و نتایج سوء بسیار مهم آن بطور مستقل بحث شود که امید است در آینده این موضوع و راههای مقابله با آن مورد بررسی قرار گیرد . مطلب سومی که بحران اخیر آنرا روشن ساخت . مسئله، حکومت های دست نشانده و وابسته در منطقه و مردم این کشورهاست . آنچه در - نگاه اول به چشم میخورد عدم توانایی این کشورها در مقابله با کمترین بحرانها و آسیب پذیری شدید آنها در برابر مخاطرات خارجی و عدم اعتماد به نفس حکمرانان و بی اعتمادیشان به ملتها میباشد . بحران اخیر چه از جهت تجاوز عراق به کویت و اشغال سهل‌الوصول آن کشور و چه از بابت حضور نیروهای آمریکایی و ... (که قبح آن به مراتب بیشتر از حضور متجاوزانه، سربازان عراق در کویت است ) نشان داد که‌علیرغم ظواهر تشریفاتی و مواضع و اظهارات پر طمطراق ، روابط گسترده، دیپلماتیك ، ثبات سیاسی! ...و... حاکمیت در این کشورها جز به مویی بند نیست . این همه تزلزل جز نتیجه، فساد و ظلم در هیئت حاکمه جدایی عمیق بین حکومتها و مردم و دور کردن ملت از امور سیاسی ، تاثیر پذیری عمیق از فرهنگ بیگانه و ترویج ضد ارزشها منحرف ساختن افکار اجتماعی و بیگانه شدن از احساسات پاك ملی و اندیشه‌های پر شور انقلابی دینی و... نیست . تا چنین است . این دولتها و ملتها محکوم به ذلت و شکست و خواری و خفتند . این ملتها باید برخی از ادوار درخشان گذشته را به یاد آورند و از زندگی انقلابی دیگر ملتها درس بیاموزند و با مطالعه، مبارزات کردهای انقلابی و مسلمان علیه رژیم بعثی عراق و و مقاومت ایران انقلابی در برابر تهاجم وسیع حکمرانان بغداد و فشارهای سیاسی ، اقتصادی . نظامی و ... آمریکا، شوروی و متحدانشان در اروپا و منطقه درس حیات با عزت گرفته و در وضعیت موجود تجدید نظر کنند

بی شك از اینگونه حاکمان وابسته و نوکر مآب ، امید خیر و صلاح و تحول و دگرگونی نیست بلکه آنچه مایه، امید است بیداری ملتها و بازگشت به فرهنگ انقلابی و غنی دینی و ملی آنان است که میتواند محور اتحاد مصبی برای استقرار نظام عادلانه . مستقل و انقلابی باشد و تنها در این صورت است که دیگر جای پایی برای ابرقدرتها در منطقه نمانده و همه ملتهای عرب و ترك و فارس و کرد و ... میتوانند با صلح و صفا و در نهایت برادری با هم زندگی کرده و در مسیر رشد و کمال تلاش نمایند .

" خدا نگهدارتان "

### شەو

شەو، بە پاپۆڕی وریشەوە
لە رووباری ئەستێرەدا
بەیداخی نوقرەی هەڵداوە
مانگ ،
بۆئەستێرە ساواکانی
هەلۆرکی هەلبەستووە
لەناوکەرووی : هەرچڵێکی دارستانا
هەزار مەلی شمشاڵ بە دەست ،دانیشتووە.
هۆ هۆ دەروێش ،
دەروێشە ئازیەت بارەکەم
ئەمشەو هاتووم
لە ناوچاوگەی چاوەکانتا
وەك رۆژانی منداڵیتیم بدوێمەوە
ئەمشەو هاتووم
بە بیستنی گورانی یەك
لە شمشاڵی گەرووی سەوزت
هێندێك بنووم
لە جوڵانەی چاوەکانتا
شەکەتی ئەم وەرزەتاڵەبسڕمەوە...

کامیرکەریمی «لەسنەوە»

# گوتوبێژ لەگەڵ : عەتا عەبدمحەمەدی

● **تکایە خۆت بناسێنە**

من عەتاعەبد محەمەدی لە ساڵی ١٣٢٨ ی هەتاوی لە شاری سەقز لەدایك بووم وهەتا پۆلی سێهەمی سەرەتایی لەشارستانی سەقز وپاشان هەتا شەشومی سەرەتایی لە شاری سنەو چەند ساڵێك لەهەمەدان دەرسم خوێندووە· پاشان گەڕامەوە سەقز و لەساڵی ١٣٥٤ دا چوومەزانستگا·

لەساڵی ١٣٤٦ دالەقوتابخانەدا هۆگری وێنەگەری بووم بەلام لەهیچ کلاسێکدا بەشداریم نەکردووە و تەنیا دڵبەندی زۆر وئەزموونم لە کاری نواندن دا یارمەتی داوم· لە ساڵی ٥٨ و ٥٩ دا لە خزمەت مامۆستای خوالێخۆشبووفەیزوڵڵا - خان ناهید دا خەریکی وێنەگەری بووم و زۆرم کەلك لە هونەرەکەی وەرگرت ولەساڵی ١٣٥٩ دا بوومە ئەندامی ئەنجومەنی هونەری ئیرشادی ئیسلامی و هەمووساڵێك لە نوێنگەکانی گشتیدا بەشداریم کرد· هەتا ساڵی ١٣٦٧ی هەتاوی لە قوتابخانە کۆتایی یەکانی شاری بۆکاندا دەرسم دەکوتەوە و ئێستا لە دانشسەرای موقەدەماتی سەقز خەریکی دەرس کوتنم·

● **مەبەستی ئێوە لەوێنەگەری چیە ولە سەر چ سەبکێك کاردەکەی؟**

لە سەرەتای کاردا لە رووم دەکێشاوە (کۆپیەکاری) لە چەند ساڵ لەمەوبەرەوە سەبکی ئەمپرسیۆنیسمم هەڵبژارد و هەول دەدەم کارەکانم نوێ و بێ مودێل بن و زۆرتر هۆگری دیمەن وسووژەکانی ناوچەی کوردستانم و هیوادارم بتوانم رۆژێك بەرهەمەکانم لەسەر داب و نەریت و دیمەنەکانی کوردستان بخەمە بەرچاو·

● **کام یەك لە کارەکانی خۆت زۆر بەدڵە ؟**

هەرکام لەتابلۆکان تایبەتی بیرەوەری یەکی جیاوازن و من هەموویانم خۆش دەوێ· راست وەك منالەکانم کەلە راستیدا جیاوازی یەکیان لەگەڵ یەك نیە·

● **لەگەڵ وێنەگەرانی ناوچە پێوەندیت هەیە ؟**

لە سەقز دەگەڵ ئاغای محەمەد ناهید و "کەماڵ تاتایی"م پێوەندی هەیە وماوەی چەند ساڵان لە بۆکان لەخزمەت ئاغایان "مستەفا شیرزاد" و "ئوسمان موبارەکی و ئاغای "نادری پەشێو" دا پێوەندی نیزیکم هەبووە و پێکەوە وێنەگەریمان کردووە و بیروڕای ئەوانم لەمەڕ تابلۆکان پرسیوە ولە ئەزموونەکانی ئەو هونەرمەندانە کەلکم وەرگر- تووە· لەو دواییانەدا لەگەڵ ئاغای هادی زیائەدین ناسیاریم پەیدا کردووە و هیوادارم بتوانم لە رێنوێنی یەکانی کەڵك وەرگرم·

**● بە بڕوای ئێوە فێرکردنی هونەر بەگشتی وخەت و وێنەگەری بە تایبەتی لەنێو قوتابخانەکاندا چۆنە ؟**

بە بڕوای من چۆنیەتی فێرکردن لە قوتابخانەکانی شاری ئێمەدا ڕێك وپێك نیە و سەرنجی پێویستی پێ نادرێ ، کە زۆرتریش دەگەڕێتەوە سەر کەم بوونی مامۆستای هونەر • هێندێك لەو کەسانەی دەرسی هونەر دەڵێنەوە تەنانەت دەورەشیان نەدیوە و هێندێك جار لە هەر مامۆستایەك کەبێکار بێ و دەرسی نەبێ بۆپڕکردنەوەی سەعاتی هونەر کەڵك وەردەگرن • بەداخەوە سەعاتی هونەر لەقوتابخانەکاندا بەسەعاتی بێکاری ناو دەبردرێ هیوادارم بەرپرسانی پەروەردە و بارهێنانی شار بۆچارەسەری ئەو مەسەلەیە زیاتر هەوڵ بدەن و لانی کەم کەسێك بنێرنە کلاسی هونەر کە لانی کەم شتێك لەهونەربزانێ •

**● جگە لە هونەری وێنەگەری چ هونەرێکی دیکەش ( خەتتاتی ، مۆسیقا و••••• ) دەزانی ؟**

جگە لە وێنەگەری ماوەی چەند ساڵ لەشانۆکانی قوتابخانەی کۆتاییدا بەشداریم کردووە و ماوەیەکە لەخزمەتی مامۆستایانی بەڕێز ئاغای محەممەد پور یان و محەممەد عیززەتی تەمرینی خەت دەکەم •

**● ئایا هاوکاری و هاوفکری لەگەڵ خاوەنڕایان و وێنەگەرانی ناوچە بە پێویست دەزانی ؟**

بەبڕوای من ڕەخنەی دڵسۆزانە و بەجێ وڕێی خاوەنڕایان یەکێك لەو خاڵانەیەکە لەپێشکەوتی هونەرا گەلێك گرینگە وهیوادارم لەو پێناوەدا هیچ چەشنە کەمترخەمی•• یەك نەکەن •

**● تاکووئێستا بۆ پێشکەوتی ئامانجەکانی کۆمەڵایەتی و گەیاندنی بیروڕا کەڵکت وەرگرتووە؟**

نەخێر • ئێستا نەگەیشتوومەتە ئەو ڕادەیەی کە بتوانم لەو بەستێنەدا خزمەتێکی بەرچاوبکەم• بەڵام کەم تاکورتێك کارم کردووە و لەڕاستیدا کارەکانی ئێمە بەچەشنێك چۆنیەتی ناوچە و ئامانجەکانی کۆمەڵایەتیشیان تێدایە• هیوادارم لە داهاتوودا بتوانم هەوڵێکی زیاتر بدەم •

**● مرخ و لێهاتوویی لاوانی کوردستان بۆ فێربوونی هونەری خەت و وێنەگەری چۆن دەبینی ؟**

بەسەرنجدان بەو ناسیاری یەی کە لەگەڵ لاوان و هۆگرانی هونەریم هەیە ، ئەو ڕاستیەم بۆدەرکەوتووە کە لاوانی کورد یەکجارخۆش زەوق و خاوەن هەستن و بە مەرجێك کە لەلایەن بنەماڵەکانەوە ئیزنیان پێ بدرێ وکەرەسەیان بۆ بکڕدرێ ، دەتوانن زۆر زوو لە زانستی مامۆستاکان کەڵك وەرگرن وبەو چەشنە لەداهاتوویەکی نیزیکدا هونەرمەندی گەورە پێشکەشی کۆمەڵ بکرێن •

**● سروە دەتوانێ چ دەورێکی لە پێشکەوتنی هونەری کورداهەبێ و چ چاوەڕوانی یەکت لەسروە هەیە ؟**

لەبەڕێوەبەرانی گۆواری ڕەنگینی سروە ڕێز دەگرم سەبارەت بەو هەوڵ وتێکۆشانەی کە لە سەرەتای دامەزرانی ناوەندەوەبۆ بووژاندنەوەی هونەری کورد هەوڵیان داوە • هیوادارم لە داهاتووشدا وێڕای لەچاپ دانی ژیاننامەی هونەرمەندانی گەورە و نووسینی گیروگرفتەکانیان لەو پێناوەدا هەنگاوی گەورەتر هەڵێننەوە•



## شاعیرانی کورد

# مامۆستا شەلماشی

"حەسەن ئیسماعیلی"

دەستێرەی ورشەداری فەرهەنگ وئـەدەبـی کورد مامۆستا مەلا محەمەدی شەلماشی کـوڕی خوالێخۆشبوومەلا محەمەد،ساڵی ١٣١٥ی هەتاوی لە گوندی سەرسەوز وخنجیلانەی شەلماش لە دایك بوو. سەرەتای خوێندنی لە لای باوکی بە کتێبە ئیسلامی یەکان دەست پێکرد. مامۆستا لە عومری جەوانیدا زوربەی ناوچەکانی کوردستان گەڕاوە. هەڵکەوتوویی ولێهاتوویی ئەوپێشاندەری ئەوەبووە کە لە داهاتوودا ناوبانگی مامۆستایەتی دەردەکا وبە هۆی کارە باشەکانی توانیبووی لە نێو دڵـی خەڵك جێگا بکاتەوە وهەمووکەس بە چاوی ڕێز و حورمەتەوە دەیڕوانی یە ئەو مامۆستای مەزن شارەزایی بەسێ زمانی:

کوردی - فارسی و عەرەبی هەبوو وبە هەرسێ زمانیش شێعری گوتووە.

دیوانی شێعرەکانی بریتی یە لەچامە غەزەل وپێنج خشتەکی، تێهەڵکێش، مەسنەوی وچوارینە سەر چاوەی شێعروئەدەبی ئەو زانایە وەکوولە شێعرەکانیەوە دەردەکەوێ خواناسی و ستایشی پێغەمبەرە.ئیمان وئەوین وشەیدا بوونی بە پێغەمبەری گەورەی ئیسلام وبنەماڵەی بەرێزی.لە هۆنراوەکانیدا ئاشکرایە.

کە چاوی کردەوە وتۆی دی وەنەوشە  
ملی کەچ بوو لە جوانی تۆوە ڕاما  
لە حەسرەت قەدی تۆداری سنەوبەر  
کشابۆ ئاسمان ئەی سەروی رەعنا  
لە حەسرەت تۆیە نێرگس،ئاوی شەونم  
دەبارێنی ودووچاوی بوونە دەریا  
زمانی دەرکشا سوێسن کەتۆی دی  
دەمی داوە شەقایق واقی وڕما  
بەطێ تەقلیدی کولم وزولفی تۆیە  
رەشە ریحانە دەیکا ولالە حەمرا  
گولالە وسونبول ولالە و گەزیزە  
لە قەترەی ئارەقت بۆن خۆشن ئاوا  
لە بەر شانازی ئەو لادێکی وەك تۆ  
بەهەشتی دابە گەنمێك دایکە حەووا  
هەتا ماوم سەناخوانی کەسێکم  
کە بۆوی چۆل پەرستی کرد " بوحەیرا "  
هەزاران قەیسەری کوفرو زەلالەت  
شەق وپەق بوون، رەمان وەك تاقی کیسرا  
ئەوا "شەلماشی" خۆی هاویشتە قاپەت  
گەدام وهاتمە بەردەرکی پادشا.

مامۆستا "شەلماشی وێنەیەکی بێ زیادوکەمی شاعیرەکانی کلاسیکە وئێمە مامۆستا بە ئاوێنەیەك دادەنێین کە وێنەکانی هەڵبژاردەی هۆنراوەی کۆنی تێدادەردەکەوێ ولە شێعرەکانی دا شوێن پێی شێعری شاعیرانی پێشووی هەڵگرتووە ولە بیر و خەیاڵیشدا لە ئاسمانی ئەواندا خولاوەتەوە.

مامۆستا شەلماشی شارەزایی تەواوی لە شەرح و حەدیس وتەفسیر وزانستە ئیسلامی یەکاندا داهەیە ولە هەموو بوارێك دا شێعروبەرهەمی جوانی بڵاوکردۆتەوە بەڵام زوربەی هونراوەکانی ئایینی وخواناسین وشاعیرلە شێعرە ئایینەکانیدا دەست رەنگینی وقەڵەم بڕشتی خۆیمان پتربۆدەردەخا.

هۆنراوەکانی ئەو هۆنەرە بەهەستە لە بابەت قالب و نێوەرۆك وەمەعناوە دەکرێنە چەند بەش و دیارە هەمووشەوبە شانە لەولقانەی خوارەوەدا رەنگ دەدەنەوە ٠

١- شێعری ئایینی وخواناسی وپاڕانەوەوستایشی خوای گەورە وپێهەڵکوتن بە پێغەمبەر ویارانی زۆربەی د یوانەکەی گرتۆتەوە.خۆش ویستنی ئیسلام وەمەبەستەکانی دینی بە تەواوی هەستی هۆنەری داگرتووە ولە سەرجەمی هەڵبەستەکانیدا ئەو کارتێکردنە بەرچاودەکەوێ٠ بە تێڕوانینێکی هەڵبەستە ئایینی یەکانی ماموستا ،بەتایبەت ئەوشێعرانەی دوایی کە دەرحەق بە پاڕانەوە بۆ رۆژی قیامەت گوتوویەتی،دەبینن کە شاعیر بە گیان ودڵ پەنادەباتە لای خودا ودەپاڕێتەوە کە لە گوناه وتاوانەکانی خۆش بێ، هەرەکوو لە سەرەتای دیوانی " باوەشێنی دڵ" دا گوتوویەتی:

**" خوداوەندا بە حەققی گەورەیی خۆت**
**کە ئەرزو ئاسمان سوژدە دەبا بۆت**
**خودا بۆ خاتری پێغەمبەرانت،**
**خودا بۆخاتری دین پەروەرانت**
**خوداوەندا بە حەققی ئالی یاسین**
**کە هەموانیان بە دۆستی تۆدەناسین**
**خودا بۆخاتری ئەصحاب و یاران**
**لەرێی تۆدا شەهیدیاندا هەزاران**
**خوداوەندا بە حەققی تابیینت**
**شەو ورۆژی دەیان کرد سەعیی دینت**
**خوداوەندا بە حەققی عالمانت**
**کە رووناکە بە عیلمی وان جیهانت**
**خودا بۆخاتری هەرچی هەزارە**
**کە ئیخلاسیان لە ناو چاودا دیارە**
**خوداوەندا بە حەققی شاهی شەمزینی**
**کە بەختی کرد سەروماڵی لە رێی دین**
**گوناهم زۆرە روحمەت بێ سنوورە**
**لە تەقسیراتی شەڵماشی ببوورە**

٢- شێعری کۆمەڵایەتی وویژدانی وئامۆژگاری کە لە نێو قالبی مەسنەوی یەکانیدابە شێوەیەکی زۆرجوان وشیرین دەری بڕیوە ولە زوربەی مەسنەوی یەکانیدا دەرسی رەوشت وئاکار وپەندوئامۆژگاری و نیوژۆکی کۆمەڵایەتی دیاری دەدا ٠ هەروەکوو لە مەسنەوی "وەسیەت دا " دەڵێ:

**"وەسیەت نامە"**

**کەماڵ و جەلال رۆڵەی شیرینم**
**یاخوا هەتا هەم مەرگتو نەبینم**
**رۆڵەکەم ئێوە ئێستا منداڵن**
**چونکە لە عومراشەش حەوت ساڵن**
**گوێ بگرن رۆڵە وەسیەت بێ لێتان**
**هەروەك ئالقەیەك بیکەنە گوێتان**
**قەڵەم هەڵگرن زۆرباش بخوێنن**
**تالە ژیان دابێ بەش نەمێنن**
**بەخسووس کە ئەورۆ دەوری خوێندنە**
**هەرخوێندن سوودی بۆپیاو وژنە**
**بەڵام رۆڵەکان باش ئاگادار بن**

بۆلانی خودا ئازاوبەکاربن
چونکە هەرعیلمێ سەرچاوە لە دین
وەرنەگرێ نابێ بۆدونیاوژین
ئێوە نازانن دونیافانی یە
مردن ئەمرێکی ناگەهانی یە
کەوایە کارێ بکەن بە پیشە
کە قازانجی بێ بۆگەل هەمیشە
ئەخلاقی چاکە مایەی عیززەتە
چونکە خولقی خۆش خولقی حەزرەتە
پیاوی بەد ئەخلاق بەدی دەنوێنێ
لەڕەو ڕەوەی ژین بە جێ دەمێنێ
پەندی پێشینیان یادتان بێتەوە
کەس بەمەلەی باب ناپەڕێتەوە
ئەوپەندە بکەن بەسەرمەشقی خۆ
بالە ئاخردانە بن رەنجەڕۆ
ساڵێك نامێکم نووسی بۆبابم
ئەویش ئەوشێعرەی نووسی بۆجوابم
اگرمیخواهی سرمایە یابی
تارنج نبری گنجی نیابی
بە تەمسیل کوتم کەماڵ و جەماڵ
دەعاوەسیەت بێ بۆ هەمووماندا ڵ

٣- شێعری شیوەن و لاواندنەوە: مامۆستا شەڵماشی پەیوەندی رووحی ودۆستایەتی دەگەڵ زۆرکەس دابووە وپاش مردنی هێندێکیان شێعری بۆ کوتوون وشیوەنی بۆگێڕاون هەروەك بەهۆی کۆچی دوایی عارف وخواناسی ئایین پەروەر و پایەبەرزی کوردخوالێخۆشبوو (شێخەمین بەنێزۆێ) شێواوی کەوتۆتە دڵ ودەروونی وشیوەنێکی بەکوڵی بۆئەوپیاوە زانایە کردووە کە گەلێ سۆزی بەکوڵی تێدایە. هەروەکوو گوتوویەتی:

" کۆچی شێخە مین"

ئەی موسوڵمانینە باتێکڕا بکەین گریان و شین
بۆفیراقی خۆشەویستوشەوچرای دین شێخەمین
دائیرەی عیلم وئەدەب لەم عەسرەدا پشتی شکا
چونکە کۆچی کردلە دنیاچۆوە فیردەوسی بەرین
والەلای عەڕشی خودای عالەم مەلایێك سەف بەسەف
مات وغەمگین وپەرێشان هاتنە خوارێ بۆزەمین
دێن دەڵێن ئەمری بە ئێمە کردووە پەروەردگار
بێینە سەرئەرزوهەمووم‌ان تازیە بۆشێخ داگرین
ئەی مەلاو سۆفی وموریدان ئەمڕۆدونیا ماتەمە
چون وەفاتی کردوە شێخم جێ نشینی سورسەلین
سۆفی نەقشی تۆبڕۆ تەبلیغی کە وپێیان بڵێ
بەومورێدانەی کە چەشتی وسوهرەوەردی وقادرین
گشت لە ئالانێ،لە بیژوێ کۆوەبن تاکووزووە
باهەمووم‌ان،داخەکەم،لێکرا جەنازەی هەڵگرین
ئەی دووچاوم خوێن ببارێنن وەکووهەوری بەهار
ئەی گەلی خوشك وبرای دینی حەیف بۆشێخەمین
گەرچی بێ نازمایەوە شەڵماشی تارۆژی جەزا
ئەودەمە داوێنی بگرە و( فادخلوهاخالدین )

مامۆستا شەڵماشی لە وێژە وئەدەبی کوردی وفارسی وعەرەبیدا زۆرشارەزابووە بە تایبەت لە وەرگێڕانی شێعری فارسی دابۆکوردی.

# ئێمەوخوێنەر

**پیرانشار : مەحموودئیبراهیمیان**

بۆکوردی فێربوون هەمووگۆوارێك بخوێندرێتەوەباشە. کۆڤاری ئاوێنەمان پێگەیشتووە وهیواداریندە ئامانجی خۆیدا سەرکەوتووبێ وخزمەت بە فەرهەنگ وئەدەب وزمانی کوردی بکا. ئێمە عەکس یاباببەتی گەیشتوو نادەینەوە بە خاوەنەکەی.تائێستا زۆرمان باسی پێغەمبەران (د.خ) وگەورە پیاوانی ئایینی دەسروەدابلاوکردۆتەوە و لەسەرئەمکارەش سوورین.وەك نووسیوتە ناتوانی بە دەست راست بنووسی وکاربکەی. دەتوانی بە مەشق وتەمرین ئەودەستەشت وەکارخەی. هەڵبەت مەشوەرەت دەکەڵ دوکتۆران پێویستە. سەرکەوتووبی.

**شنۆ : جەمالْ عەلی بەلاغی**

دایکی حەزرەتی عیسا ناوی مەریەمە. ئەوەی کە بە ناوبردنی ئەم دایکە پیرۆزە - قەڵ لە خۆوە بکرێتەوە زۆرتر خورافاتە. ئەوەش زۆرتر لە سەر دایکی حەزرەتی مووساوە گوتراوە کە ناوی " یووکاپوود " یان " یووکابێد " بووە.

**نەغەدە: ئیدریس حوسێنی**

لەوەلامی پرسیارەکەت دادەڵێین کە بۆمان روون نیە جابیرئیبنی حەیان(جابر ابن حیان) کوردبووە یاخێر. بەلام دەزانین دەوروبەری سالانی ۱۵۹ تا ۱۸۶ ی کۆچی مانگی لە کووفە ژیاوە وزۆرزانایەکی گەورە بووە وکیمیازانێکی بەناوبانگ بووە. لەو زانایە زۆر کتێب وریساله ماونەوە کە زۆرتریان لە کتێبخانەکانی ئوروپان.

**ورمێ: یونسی شکارچی**

لەمەڕ پیت کەلێك وەك ، الم،یس طە دە قورئانی پیرۆزدا بۆچوون ولێکدانەوەی زۆرهەیە دەتوانی نامەیەك لە(مرکز بزرگ اسلامی ارومیه) بنووسی وجوابی پرسیارە - کەت وەرگریەوە.

ناوی قەدیمی ئێران هەرئێران بووە و ئەم ناوە دەشانامەی فیردەوسیدا زۆر دەکار کراوە. ناوی ورمێ یاشوورمیاش زۆرکۆنە و دەزمانی پەهلەویدا کرا بە" رضائیە"دەگەلْ سەرکەوتنی شۆرشی ئیسلامی ناوەکۆنەکە دووبارە دراوە بەم شارە جوانە.

لەمەڕ ئەوەی کە پێغەمبەرێك هاتبێ و زبانی تورکی بووبێ یاکوردی یافارسی هەر ئەوەندە دەزانین کە زەردەشت پێغەمبەرێکی ئێرانی یە ولەسەر کۆرەپانی بانەووی (فدلات) ئێراندا ئایینی خۆی بلاوکردۆتەوە و پاش هاتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام دەزەمانی حەزرەتی عومەردا ئێرانی یەکان ئیسلامیان وەرگرت وئایینی زەردەشتی وردە وردە فەرامۆش کرا وئەمڕۆ ژمارەیەکی کەم ماون کە ئەم ئایینە دەکار دێنن.

**بۆکان: محەمەد نوورمحەممەدی**

دەنامەکەتدا هەڵەیەکت بۆراستکردووینە زۆرسپاست دەکەین یەکێك لە لایەنباشەکانی بەشی ئێمە وخوێنەر ئەوەیە کە خوێنەرانی بەرێز هەڵەمان بۆراست بکەنەوە وئێمەش زۆربە خۆشحالی یەوە رەخنە ورێنوێنی وەردەگرین چونکە مەبەست خزمەتەوخزمەتیش بەکەلە کۆمەکی کارامەترە. ئەوادەقی رێنوێنی یەکەی کاك محەمەد لە ژێرەوە بلاو دەکەینەوە.

"لە سروەی ژمارە ۴۴ دالە بەشی ئێمە و خوێنەر لاپەڕەی ۳۰ لە پرسیاری خوێنەرێك لە بۆکانەوە نووسیبووتان کۆڕی میسباح (ئەدەب ) لە گوندی ئەرمەنی بلاغی یە. بەئاگاداریتان رادەگەیەنم کە میسباح لە گوندی ئەرمەنی بلاغی لە دایك بووە ولە گوندی "باغچە"ی فەیزوللابەگی کۆچی دوایی کردووە. واتە کۆڕی میسباح(ئەدەب ) لە گوندی باغچە لە ناوچەی فەیزوللابەگی بۆکان دایە.

**بۆکان، گوندی دووکچی محێدین مەنسووری**

ویستووتە بەسەرهاتی ناسری رەزازی - هونەرمەندی گۆرانی بێژت بۆ بلاو بکەینەوە. بەسەرچاوان لە داهاتوودا تێدەکۆشین ئەویش بە خوێنەران بناسێنین. ئەوجار نووسیوتە لە نووسینی کوردی داتووشی هەڵە دەبی. پێشەکی باشەوەت پێ بڵێین نامەکەت کە بە کوردی نووسراوە هەڵەی زۆرکەم تێدایە وخەتەکەشی زۆرخۆشە. بۆ ئەوەی کوردی نووسین باش فێربی لەرێنووسی کۆڤاری سروە کەلك وەرگرە.بزانە ئێمە مەسەلەن فلان وازەچۆن دەنووسین ئەتۆش هەر ئاوای بنووسە. بە هێندێك مەشق و نووسینەوە هەڵە لەناودەچێ ودەبی بەمیرزا.

**سەقز : مەحموود حەسەن زادە**

ئیختیاری لە چاپدانەوەی کتێبی ( بۆ کوردستان) ی مامۆستا هەژار بە دەست خۆیەتی وئێمە خاوەنی نین( تاریك و روون)ی مامۆستا هێمنیش هەروەها.

لەمەڕ هێندی باس وبابەتی وەك باسی خاووخێزان ئێمە تائێستا زۆرتێکۆشاوین بەرەنکاری دژواری یەکانی کۆمەڵگای کوردەواری ببین وبۆلە ناوبردنیان خەبات بکەین. زۆر کەلێنمان کردۆتەوە کە دەردی دڵی گەلی تێدا هەڵرێژین وخودایاربێ لە داهاتووشدا لەسەر ئەم رێبازە دەڕۆین.

کرانی کتێب ، بەتایبەتی کتێب شاردنەوە و کرانفرۆشی لەلایەن هێندێك لە کتێب فرۆشەکانەوە دەردێکی گرانە وئێمە زۆرجار بەتەنز ونامە وچیرۆك باسمان کردووە. بەلام برای بەرێزدەسەردەمی گرانی وتاناکۆراوقاتی وقڕی دا کێ هەیە گوێ بداتە من وتۆ؟!

سەردەشت : حوسێن خدریان

بەکورتە نامەیەك ئەونوکتە جوان وقووڵەی بۆنا ردووین چونکە بەشی ئێمەوخوێنەر لایەنگری زۆرە دێرەدا بڵاوی دەکەینەوە·

"جارێك پیاوێك لە چوار رێ یانی شارێکدا رووی دەئاسمان کرد· هەرکەس دەهات رووی دەئاسمان دەکردو سەری هەڵدێنا · خەڵکێکی زۆرکۆبوونەوە ورێکاگیراوهەردەهاتو حەشامەت زۆرتردەبوون کە هەموویان چاویان دەئاسمان بڕیبوو· پۆلیسی شارهات بڵاوەی بە خەڵك کرد وپرسی چ بووە تا کەیشتنە یەکەم کەس کوتی من چووم بۆ لای دوکتۆر وتم خوێنی لووتم راناوەستێ · ئەویش کوتی ئەگەر خوێن هات رووەدئاسمان کە خوێنی لووتت رادەوەستێ!!"

جوانڕۆ : ئەحمەدتەنهایی

برای بەڕێز · ئەوپیاوە بە نرخەی باست کردووە وکۆیا زۆرشێعروئاهەنگ .م.دەزانی و رووداوەکانی ناوچەی کردووە بە بەیت ، زۆر شایانی ناساندنە· ئەگەر بتوانی وتووێژێکی دەگەڵ بکەی ودەگەڵ وێنەی بۆمان بنێری ، هەر وەها نموونەیەکیش لە کارەکانی ، ئێمە بڵاوی دەکەینەوەو ئەم هونەرمەندە خۆڕستە بە جەماوەر دەناسێنین·

بۆکان : خوشکە مریەم ودیپلۆمەی بێکار

ئێمە سەرگوزەشت وبیروڕای مامۆستا هەژارمان دەسرووەی ژمارە ١٨-١٩ بڵاو کردۆتەوە· دیارە دەگەڵ شاعیری زیندووشەم کارە بە وتووێژ ئەنجام دەدرێ وئێمەش هەر وامان کردووە· ئەگەر دەتەوێ نامەیەك بۆئەم بەرێزە بنووسی بۆئێمەی بنێرە بە دەستی دەگا·

هۆی ئەوە کە دوو(واو) بۆهێندێ واژە دادەنێین ئەوەیە کە بێژ (تلفظ)ی ئەم جۆرە واژانە درێژە وەك سوور- دوور- پوور ئەگەر ئەوانە بە (واو)ێك بنووسین تووشی سەر لێشێواوی دەبین مەسەلەن (کوور) کە مانای پشت کۆم دەداتەگەر بە(واو)ێك بنووسرێ دەبێتە (کوڕ) یانی (پسر)ی فارسی · یا (چوون) بە مانای رۆیشتن بە واوێك دەبێتە (چون) کە مانای چونکە دەدا·

بۆ وەرگێرانی کتێب لە ئێراندا ئیزن لە نووسەرەکەی پێویست نیە بە تایبەتی ئەگەر دەئارادا نەبێ.ئەگەر دەوەرگێڕاندا تووشی واژەیەك بووی کە مانای نەواوی نیيە وابا شە لە بەرامبەرەکەی (معادل) کەڵك وەربگری مەسەلەن فارس دەڵێن "فلانی نخود هرآشی است ) کە بە کوردی دەبێتە(فلانی وەك لیپەوایە دەهەمووچێشتێك داهەیە)·

کوردی نووسینەکەت زۆر جوانەودەتوانی بە وردبوونەوە وەمەشق کردن باشتریش بنووسی·

سەردەشت: محەمەد بایەزیدی

وەك نووسیوتە نامەت زۆرنادووەوپرسیارێ جۆراجۆرت لێکردووین کە کەمیان جواب دراوەتەوە· هەروەك دەزانی ئێمە رۆژنیەدەیان نامە مان بۆدێیا وبەداخەوە ناتوانین جوابی هەموان بدەینەوە·

ئەگەر شێعرەکانت جوان بووبایە بێگومان بڵاو دەکرانەوە بەڵام بۆ لاوێکی تازەکاری وەك تۆ درەنگ نیە· تێکوشە زۆرتر حەول بدەی وزۆرتر موتا لابکەی وەك نووسیوتە دەنگت خۆشە· دەنگی خۆش نیعمەتی خودا- داوە· واباشە وردە وردە فێری مۆسیقا و گۆرانی کوتن ببێ وئەو نیعمە تەدەکار بێنی· بەڵام رێنوێنی ئێمە ئەوەیە کە مۆسیقای رەسەنی کوردی فێرببی ئەگەر عەکس و نووسراوەی جوانت هەیە بۆمان بنێرە سەرکەوتووبی·

قوروە: ئیسماعیل مەجیدی

برای بەڕێز نەورۆز جێژنێکی مێژوویی و نەتەوایەتی هەموو گەلانی ئاریایی رۆژهەڵاتی ناوەراستە و لایەنی ئایینی نیە · دیارە ئیسلام بۆهەرشتێکی مێژوویی و نەتەوایەتی رێزدادەنێ ودژایەتی دەگەڵ ناکا·

بۆکان : حوسێن غەریبی

سەرگوزەشتی قارەمانی گەورەی کورد سوڵتان سەلاحەدینی ئەییووبی لە ژمارەکانی ١و٢و٣و٤ ی کۆڤاری سروەدا بڵاو بۆتەوە· دە سەردەمی سوڵتان سەلاحەدین دا ناسیۆنالیسم یانەتەوە ویستی نەبووە وخەڵك زۆرتر بۆ پەرە پێدانی دین و جیهاد لە رێگای ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا تێکۆشاون· دیارە ئینسان دە هەر پلە وپایەیەك دابێ بە پێی هەل و مەرجی مێژوو دەجووڵێتەوە وئەوەش بۆ سەلاحەدین نابێتە عەیب وئیراد·

قەڵای جوانڕۆ: موزەفەر ئەمینی

تەورات کتێبی ئایینی جوولەکەکان بە زمانی عیبری یە بەڵام بە زۆر زمانی دیکەش وەرگێڕدراوەتەوە· ئینجیلیش هەردەسێ بەوزبانە بووبێ کە ئێستا بەزبانی لاتین و هەموو زبانەکانی دیکەی دنیا هەیە· قەڵخانی عەشیرەتێکی کوردن وهیچ یا سایەکی ئیسلامیش پێوەندی گرتنی ئێمەی دەگەڵیان حەرام نەکردووە·

بۆکان : سەربازی دلێر سەلیم سالحزادە

برای بەڕێز رۆژی لەدایکبوون ووەفاتی پێغەمبەر(ص) وچێ نشینەکانی(د·خ) دەکتێبە مێژوویی یەکاندا هەیە ودە تەقو - یمانیشدا چاپ کراون· دەتوانی لەوا ن کەڵك وەرگری یا لە مامۆستاایینی یەکان بپرسی کە ئەغلەب کتێبی مێژووی ئیسلامیان بەلاوە هەیە·

نامەی ئەم ئازیزانەشمان بەدەست گەیشتووە :

تەورێز : محێدین شەریفی

مەرەند: مستەفا ئیبراهیمی

بۆکان: خالید سالح زاهید، کاك غەمبار ، حوسێن غەریبی ، فەتاح فەهیمی،عومەر شەریفی - محەمەد جیهانی، سولەیمان داوەند- حیسام شێخ محەمەدی ،ناسرفەتاحی- حەسەن عەبدیان·

بانە: محەمەد رەمەزانی ،سمایل قادر - عەباسیان - جەلال مەولانی -کەریم شەعبانی-

ورمێ: غەمگین مێرگەسووری- عیسمەت میرووزی·

ئیسفەهان : محەمەد سالح محەمەدی·

گیلانغەرب: محەمەد سەعید ئاسنەمژن - محەمەدئەمین حەسەنپوور ·

مەهاباد: محەمەدی بیخوشی - مستەفا جۆرابچی· محەمەدسولەیمانی،جەلال- یۆسفی ئازەر، حەمەدەمین پیرخدری ،سەید ئەنوەر عەبدوڵلا پوور·

رەوانسەر : خەبات حەلەبچەیی·

مەراغە: عەبدوڵلا کەریمی·

بۆکان: عەزیز مستەفازادە·

ئەهواز: هاشم حەیدەری·

کەرەج مێهرشەهر : ئەحمەد رەسایی·

نەغەدە،گەرگوول:ئومێدئازەرەنگ- مەعسوومە مەحموودی - سمایل شەریفی- ئیدریس حوسێنی - کورۆش جوبرەئیل - عەزیزسابیر - رۆژبەیانی - عەلیمحەمەدی - هەمزە ئیبراهیمی ئەقدەم - مستەفا ئیبراهیمی - ئازەر·



**مەهاباد: ئەسعەد**

کاک ئەسعەدی بیست ساڵان ! شاکارێکی خولقاندووە وداوای رێنموونی لە ئێمە کردووە.

کاک ئەسعەد دەنووسێ:

" دوای تەواوبوونی سەربازی ، ناردمە خواز بێنی کچێك . بەڵام باوك ودایکی کچە کە،رازی نەبوون و دوای ماویەك ، لە کابرایەکیان مارەکرد. بەڵام چونکە من خۆشم دەویست وکچەش خۆی رازی بە هەڵگرتن بوو، رەدووکەوت ومنیش رەواندم و"........" . بەڵام لە دادگاکچە بە ۴۰ زەربە شەللاخ مەحکووم کرا ودوای ئەوە تەحویلی باوکی درایەوە منیش دوای خواردنی ۷۴ زەربەشەللاخ ئازاد کرام. دوو پرسیارم هەیە:

۱- ئایا قانوون حەقی ئەوەی هەیە، ئێمە مەحکووم بە شەللاخ بکا وکچە تەحویلی باوکی بداتەوە؟ چونکە ئێمە یەکترمان خۆش دەوێ وئەوکچە وەکوو خێزانی منە!

۲- ئایا دەبێ چ بکەم .. ژن بهێنم ، یان کچە بخوازم ؟

- بەڵێ ، کاک ئەسعەد لە قانوون گلەیی دەکا ، رەنگە ئەم برادەرە چاوەڕوانی ئەوە بووە کە بەرپرسانی دادگا ، بە بۆنەی کارە شیرینەکەیەوە ئەم لاوئەولای ماچ کەن و لە دەس خۆشانەی رەواندنی ژنی شوودار ،خەڵاتی بدەنێ وتەشویقی بکەن...

کام خووخدەی ئینسانی وشەرعی و ویژدانی بەشەری ئەوکارە پەسەند دەکا کە جەنابت کردووتە. پێت وایە ئەوسزایە ، لەبەرانبەری تاوانەکەدا، هەرهیچ نیە . پیاو دەبێ نەختێك ئینسافی هەبێ.

- ئەگەر مێردی ژنەکە تەڵاقی بدات ودایك و بابیشی رازی بن وەزیفەی ویژدانی ئێوە، حوکم دەکا ،مارەی بکەی .

**کاک - ك - ن -**

هەڵگرتن ورەواندنی کچ ، یەکێك لە ئاکارە دزێوو زۆرناپەسەندەکانە . نە لەباری شەرعی یەوە دروستەونە داب ودەستووری کۆمەڵ قەبووڵی دەکا و نە قانوون دانی پێدادەنێ..

زۆرجار. شاهیدی رووداو وکارەساتی دڵتەزین بووین کە ئاکامی ئەم کردەوە ناشیرینەیە نامەی زۆرمان لەم بابەتەوە دەکاتێ. بەراستی ، ج وەڵامێك بدەینەوە. هۆی ئەم کردەوە چیە. چی دەبێتە باعیسی ئەوە کچێك هەموو عاتیفە وهەستی خۆشەویستی بنەماڵە ودایك وبابی خۆی پێ شێل بکا وبەرەوچارەنووسێکی نادیاروبێ سەروشوێن سەرهەڵگرێ. ئایا دایك وباوکە سەخت گیرەکان هەرگیز بیریان لەم موشکیلە کۆمەڵایەتی یەکردۆتەوە. ئایا هۆی بنەڕەتی هەڵاتنی کچ ، سەختگیری وکۆسپ دانان ، لە رێگای پێوەند وئیزدەواجی کچ وکوڕ نیە.... هێندێ پێیان وایە... لەکاتی سوودانی کچانیان دا ، خەریك سەودای مەڕوماڵاتن... کچ دەفرۆشن... بیرلە هیچ ناکەنەوە. جگە ئەوکیرفانەی کە بۆ سوود وقازانجی کچ فرۆشی یەکەیان دووریویانە.. بەهێنانەگۆڕی شیربایی ومارەیی وزێڕو. هەزار جۆر بیانووی دیکە، دەبنە کۆسپی پێك هاتنی ژیانی بەرەی نوێ کۆمەڵگا !... ئایا هەڵاتن ورەواندن ورەدووکەوتنی کچ وکوڕ پێوەندییان بەوپەڵپ وبیانوو وکران فرۆشیانەوە نیە..بۆنەختێك

بیرناکەنەوە· کچ ، ئینسانە·· شەرافەتی هەیە· کوڕێکیش کە دەیەوێ ژن بهێنێ وخێزانێك پێك بێنێ،لەسەرەتایێ خێزانداریەیە ، ونوێ ماڵە ولەکوێ بێنێ···· ئەو هەموو پەلێپ و بیانووە دابین بکات···

- برای بەرێزو خۆشەویست، ئەوە تەنیا موشکیلی تۆنیە· کرێ یەکی کۆمەڵایەتیە· ئەگەر بنەماڵەکان ، باوکودایکان وگەورەی ماڵان ، بە پێی شەرع ورێ وشوێن ودەستووراتی ئیسلام رەفتار بکەن· ئەم کۆسپ وگرێ کوێرانەش دەرەونەوە·

خۆکوشتن ،وێڕای حەرام بوون و عەزابی ئاخیرەت· بێ وازی کەسایەتی ولاوازی رۆحی مرۆڤ دەگەیەنی و هەڵاتن بەرامبەر تەنگ وچەڵەمەکانی ژیان نیشان دەدا · کەوایە، پێ لەعەرزقایم راکرە وراە وەستە وبە ئەندێشە و بیری خولقێنەری خۆت بارودۆخی ژیان بگۆڕە·"

---

**برایبان:** عەبدوڵڵا عەزیزی **"سنە"**- ئیبراهیم عەلیزادە **"سەردەشت"** کاك هاوڕێ **"مەریوان"** کاك ئیدریس **"چەپان"** چا لاك ئیبراهیم **" پیرانشار"** موراد مەحموود - عوسمان پەراکەندە- کەماڵ وەتەن دووست**" بۆکان":** ب - ت **" پیرانشار"** هەژار **" قەرجەی سەقز"** رەحمان **"بۆکان"** لوقمان مەهدی - مەحموود بەهرامی**"مەریوان"** ع - م **" میرە دێ" ك** - قادری **" مەهاباد"** ع ئیبراهیمی**"سەقز"** علی - د **"بۆکان"** کاك دڵشاد· مەحموود ح ، **"پیرانشار"** ع - م **"سەقز"** کاك سولەیمان - ب - فەتاح مام رۆستەمی- ئەوبرادەرانەش**کە** نامەیان بۆنا ردووین وێڕای سوپاس دەتوانن وەڵامی پرسیارەکانیان دەنێو وەڵامی کاك حەمە ساڵح خزری وکاك کەمال - ن دا،بدۆزنەوە · **برایانی بەڕێز:** کاك ع - د - **"ئیلام"** کاك ئامانج - ع -" کاك جەلال غەمبار **"بۆکان"**کاك حوسێن وتەمیشی **"بۆکان"** کاك سمکۆ- ئەندیمشك· "

زۆرجار ، دەکۆواری سروەدا ، سەبارەت بە مەسەلەی "ژن بەژن " وتارمان بڵاو کردۆتەوە ولە داهاتووشدا ، چونکە ئەوکردەوە بە کرێ وموشکیلێکی کۆمەڵایەتی دەزانین ،هەر بەردەوامی ئەوکارە دەبین· ئەم ئاکارە ناشیرینە دژی شەرع وئیخلاق ومرۆڤایەتیوشارستانی یەتە· بەداخەوە ، دەکۆمەڵگای ئێمەدا ،بۆتەرەسمێکی داسەپێنراو وهێشتا هێندێ لە بنەماڵەکان ، هەرچەند کە دەزانن ئاکاری ئەوجۆرە مامڵە کردنە، بە کوێ دەکا و دەیشزانن ، زەرەری لە قازانجی زۆرترە ، هەر درێژە بەم کارە دەدەن و داهاتووی خۆشەویستەکانی خۆیان دەخەنە بەر پەلاماری زەبروزەنگی ئاکامی کردەوەناحەزەکەیان · ئێمە نایژین ئەوجۆرە مامڵە کردنە، هەمووی هەر وای لێ دێ و···· ئێمە بە کشتی کردەوە کە مەحکووم دەکەین و پێمان وایە دەبێ لە بنەڕەتەوە ئەو جۆرەسەودا و ئاڵ وکۆڕە خاشە بڕبکرێ···

دیارە ، ئەم کارەش ، بە دەست وهیمەتی مامۆستا ئایینی یەکان جێ بە جێ دەکرێ·



ناوی کتێب: شیوەنی ئینسانی (کۆمەڵەشێعر)
کۆکردنەوەی: تەنیا
٢١٠ لاپەڕە - نرخ ١١٠ تمەن
بڵاوکەرەوە: ناوەندی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ وئەدەبی کوردی "ئینتشاراتی سەلاحەدینی ئەییووبی"

شیوەنی ئینسانی فرمێسکی شێعرە ولەچاوی قەڵەم تکاوە · ئەوکتێبە باری ئەدەبی شێعری کوردی لە و سالانەی دواییدا ، تارادەیەك نیشان دەدا · هاواری کۆمەڵە شاعیرێکە بۆدەردێکی کشتی· لەشێرکۆبێکەس ومامۆستا حەقیقی یەوە بگرە هەتاشاعیرانی لاوی خۆش هەست· شیوەنە بۆ زامی هەتوان نەکراوی کارەساتی هەڵەبجە·

# دەسکەوتەکانی ئەنجومەنی ئەدەبی بانە

« قازی ئەحمەد »



هیچ ئاکاداری ئەوە نەبووین کەبانە ئەنجومەنی ئەدەبی هەیە تاکوو رۆژێك لەرۆژان کاك کەریمی دافیعی شاعیری خاوەن چێژوبەدەسەڵات دەکەڵ دۆستێکی رەزا سووك بەناوی عەتانەهایی لێمان وەژوور کەوتن و زۆربەکەرمی بۆبەشداری دەشەوانی شێعروکۆڕوکۆبوو-نەوەکانی ئەنجومەنی بانەدا بانگ هێشتنیان کردین • لەسەر ئەم بانگ هێشتنە رۆژی شەممە ( ٦٩/٦/٣ ) لە ورمێوە بەرەو بانە کەوتینەرێ • دەستەی ئێمە بریتی بوون لە کاك سەلمان موحەددیس حوسێنی ، کــاك پەرویزی جیهانی،کاك عەزیز کەیخوسرەوی ،کــاك رەسووڵ وەیسی وکاك مارف ئاغایی وکاك جــە لال مەلەکشاونووسەری ئەم بابەتە ( ئەحمەدقازی )• هەوای مەڵبەندی ورمێ وەهابادوبۆکان وسەقز وبانە لە مانگی خەرمانانـدا وردە وردە بەرەوفێنکی دەرواوگــەرما کورتینی نامێنێ بۆیە سەفەرەکەمان بەخۆشی وبــێ ئارەق رشتن بەئەنجام گەیشت • شەو لەسەقزماینەوەو پــاش خــواردنــی‌شیــو لــە مــاڵی ئــاغــای محەمەدی ( ناشروکتێب فرۆش ) بۆخەوتن وهێندێــك کاری نووسین رۆیشتینە ماڵی کاك عومەری فاروو قی• بەیانی رۆژی یەکشەممــە( ٦٩/٦/٤ ) پێش نـــەهار گەیشتینە شاری بانە • رێگای نێوان سەقز وبانە ٥٥ کیلۆمیترە کەزۆرباش ئاسفالت کراو ە ولە کەلی خــان تونێلێك لێدراوە کەرێگاکە زۆرکورت دەکاتەوە•هەرکە لەودیوی تونێلەکە بە رووکاری بانەدا سەردەردێنــی لێرەوارو جەنگەڵ دەست پێدەکا • کە دیمەنی زۆر جوان و دڵبزوێن دەخوڵقێنێ وماندوویی‌لەش وگیانی موسافیر و رێبوار دەسڕێ • داخ وکەسەر کەلێرەوارەکان ئاسەواری وێرانی ودەستدرێژی لە رادە بەدەری ئادەمیزادیان پێوە دیارە وزۆر قەدپاڵ وباسك ودۆڵ وشیو بەجارێك بوونــە رووتەن و داریان لێ نەماوە•

ئەنجومەنی ئەدەبی وئیدارەی ئیرشادی ئیسلامــی بانە،یانەی فەرهەنگ ( خانەی فەرهەنگ ) یان بۆمیوانــان تەرخان کردبوو• ماڵێکی خۆش و پــڕدارو باروستێبەرو سایەی فێنك • هەرکە وەژوور کەوتین جەماوەرێکــی زۆرمان ئاشناونائاشنا بەپیرەوە هاتن و بەکــەرمی وەریان گــرتین و چای تازە دەمیش کە دەتاریف نایە ! لەجێگای ئاوا دا پیاو دەڵێی دەیان ساڵە یەکتردەناسێ• سیماو روخساری ئەوانەی بەعومری خۆت نەتدیون بــە یەکەم نیگا جێگەی خۆیان دەدڵدا دەکەنەوە• شادی و خەندە وپێکەنین دەسکەوتێکی ئاسانی ئەم جۆرە جێگا - یانەیە• بەپێچەوانەی بازار وئیدارە وبانك و••••• • کە هەموو مرح ومۆن ونەدوێنن،لێرە رووخۆشی و قســە خۆشی وبزە و پێکەنین دادەبارێ ولەتەنیشت هەرکــەس دادەنیشی هەست بەکەرمی یەکیەتی ودۆستایـــەتــی دەکەی •

شام وفراوێن وبەرچایی لە لایەن ئەنجومەنی ئەدەبی-یەوە دابین کرابوو• دەماوەی ئەوچەن رۆژەدا زۆر بــە کەرمی لە هەموو بارێکەوە پەزیراییمان لێکراو کــورد کوتەنی بەعومری خۆمان واتێروتەسەل نەبووین • بــە پێچەوانەی بانگ هێشتنەکانی پێشووی شارەکانی دیکە. لەبانە هیچ بێ نەزمی وتێکەڵ پێکەڵی وسەرلێشێواو - یمان نەدیت • بەراستی نەزم وزاکوونێکی بەرچــا ؤ دەکۆڕێ دابوو• لەسەر ئەوەش راکەزیاتر لەمەت کــە ی

بانگ هێشتن کرابوون بەرپرسەکان ئەوەندە جوانیان بەرنامە داڕشتبوو کەکەس وەکەس نەدەکەوت و بەرنامەکان زۆر بەجوانی بەڕێوە دەچوون • بۆ هەر جێگایەك چووبای ماشێن هەرکات حازربوو • جێگای خەوتن وحەسانەوە زۆرخۆش بوو • ئێمە لەلایەن ناوەندی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ وئەدەبی کورد سپاسی ئەونەزم وڕێك وپێکی یە دەکەین و ددان بەوە دادێنین کە زۆر شت لەبانە فێربووین •

**یەکەم** بەرنامەی شەوی شێعر ودانیشتن لەسەعات هەشت ونیوی پاش نیوەڕۆی یەکشەممە لە ساڵۆنی ( امورتربیتی ) داپێك هات • یەکەم شەو زۆرتر شێعرمان گوێ لێبوو • دووسێ وتاریش کرابوونە ناو ئاخنی شێعرەکان • ئەوەی شایانی باسە کەڵە شاعیر و زانای لێهاتوو دەکۆڕەکەدا بەشداریان کردبوو کە لە سەرانسەری کوردستانەوە ولەتاران وخۆراسانەوە خۆیان گەیاندبووە بانە • خانم دوکتۆر مەهیندوختی موعتەمەدی،محەمەد رەئووف تەوەکولی (لەتارانەوە) کەلیمولڵای تەوەحودی ( لەخۆراسانەوە ) مامۆستا ئەحمەدهەردی وحەمەباقی وجەوهەر کرمانج و هەقاڵ کوێستانی و زۆرکەسی دیکەش بەشداریان کردبوو • مامۆستا هەژار بەداخەوە بەپێچەوانەی ویستی خۆی لەبەر نەخۆشی نەیتوانی بوو بەشداری بکا • ئەوەی زۆر بەرچاو بوو بەشداری چالاکانەی مامۆستا ئەحمەد هەردی بوو کەزۆر بەوردی گوێی دەدا هەموو وتارەکان و دەوچەند رۆژەدا لەسەر ئەوەش راکە تووشی نەخۆشی سەخت بوو رەخنەگری یەکی باشی کرد وهەڵوێست و بۆچوونی خۆی بەوردی بەدانیشتوانی کۆڕ رادەگەیاند تەنانەت دەئاخرین شەودا کە دەهەوای ئازاد وعەتراوی شاری بانەدا پێك هات وچەند هەزار کەس بەشداریان کردبوو شێعری سیت فاتیمەی دەگەڵ شێعرێکی دیکە بۆ خوێندینەوە • کاك کەلیمولڵاش زۆر چالاکی وهەڵوو-راوی نواند وبە زاراوەی کرمانجی خۆراسان وتار و شێعری خوێندەوە • باقی بەشدارانیش لەهەموو شوێنەکانی تری کوردستانەوە شێعری جوان و گوتاری وێك وپێك یان خوێندەوە کەزۆر بەکەلك وبایەخ بوون • ئەو مەبەستە زۆر بەرچاو بووکە لە دانیشتنەکانی ئەمجارەماندا بەشدار ان زۆرتر لەجاران سەرنجیان دابووە سەر لایەنە جۆراوجۆرەکانی فەرهەنگ و ئەدەبی کورد وزۆر زانستی یانە لەسەر لایەنی جۆراوجۆری بابەتەکان دوابوون • بۆنموونە چەند وتاری باشمان لەسەر لایەنەکانی بەیتی کوردی لەکاك مارف ئاغایی، پەرویزی جیهانی وعەتا نەهایی بیست و زۆرکەسیش لەسەر زبانی یەککرتوو باس ولێکولێنەوەی بابەتی یان هێنا کۆڕێ • لەوانە دەتوانین دوکتۆر سۆران فەریوەر ، ئەحمەدقازی ، عەزیز کەیخوسرەوی ، پەرویزجیهانی ، حەکیم مەلاسالح ، فەروخ نیعمەتپوور ناوبەرین + هەروەها لەسەر وەرگێڕان وچیرۆکنووسینەوە لە لایەن کاك رەسووڵ وەیسی وچەند کەسی دیکەوە وتار بڵاو کراوە.رەخنەش جێگای تایبەتی خۆی هەبوو و زۆرمان رەخنەی باش لەلایەن بەشدارانەوە لەسە رشێعر و نووسین وچیرۆکنووسین پێشکەش کرا • بەرنامە وێژ و کارگەردانی ئەوچەند رۆژاتە دوکتۆر گۆێژە زەنگەنە بوو کە دەکاری خۆی دا زۆر شارەزابوو • رەونەقێکی زۆری دابوو بە بەرنامەکە •

نێوان نێوان بە درێژایی بەرنامەکان بەرنامەی مۆسیقاش گونجانرابوو کەماندوویەتی‌کیان و لەشی لەبیردەبردینەوە • ئەوەی کەنابێ لە باسکردنی خۆ بپارێزین پەزیرایی گەرمی هەموو خەڵکی شاری بانە بوو • لەهەموو جێگایەك دەگەڵ رێز وحورمەتی خەڵك رووبەڕوو دەبووینەوە •

شاری بانە لەسەر ئەوەش را کەزۆر سەڵای بەسەر هاتووە و بەتایبەتی لە لایەن رژیمی بەعسەوە دەماوەی چەند ساڵ شەردا زۆرجار بۆمباران کراو زۆرسەدەمەی گەورەی وێکەوت ئێستا وەك هێلانەیەکی رێك و پێك دەباوەشی لێرەوارەکاندا بەرەو ئاوەدانی وخێرو بەرە-کەت ورەونەق دەڕوا • کاتێك لە قاوەخانەکەی دووکانان را چاو لەشاردەکەی خۆشەویستی یەکی قووڵ بەرامبەر بەشار وئەوخەڵکەی لەژێرەوە دێن و دەچن هەست پێ دەکەی • دوعای بۆدەکەی ئاوەدان تربێ و خودای گەورە پارێزەری بێ •

دانیشتنی پاش نیوەڕۆی رۆژی سێ شەممە ( ۶۹/۶/۶ ) بۆباس ولێکۆڵینەوە ورەخنەگرتن لەسەر گۆڤاری سروە وبڵاوکراوەکانی دیکەی ناوەند تەرخان کرابوو • بەپێشنیاری ئێمە ئەم رەخنە و باس لێکردنە

باوەشی بۆ کۆواری ئاوێنە و ئەسحابی ئینقیلاب و نووسەری کوردستانیش کردەوە و زۆر پرسیار وپێشنیار کران وجواب درانەوە ٠ ئەم دانیشتنە بۆ ئێمە زۆر بەکەلك بوو ٠ لەهەمانکاتیشدا روونی کردەوە کە خەڵکی کوردستان چاوی هومێدیان بڕیوەتە ئەم ناوەندە و زۆر هیوایان بە پاشە ڕۆژی ئەم ناوەندە هەیە٠ نوێنەری گۆڤاری ئاوێنە کاك عەباس عەزیزی بەوتارێکی جوان و هەمەلایەنە رێبازی گۆواری ئاوێنەی روون کردەوە و ئەوەی جێگای خۆشحاڵی یە پێداگری گۆواری ئاوێنە بوو لەسەر یەکیەتی رێنووس وپاراستنی ئەودەسکەو - تانەی کە گەلی کورد دەبەستێنی رۆشن بیری وفەرهەنگ وئەدەبدا وەدەستی هێناوە٠ هەر دەو دانیشتنەدا ئەو هەواڵە خۆشەشمان بیست کە قەرارە گۆواری ئەسحابی ئینقیلاب کەئێستا بەفارسی دەردەچێ لەمەو دوانیوەی ببێتە کوردی ٠ ئەنجامی ئەم دانیشتنە ئەوە بوو کە هەموومان پێداگربووین لەسەر ئەوە کەهەموونووسراوەو بڵاو کراوەیەك لەکوردستاندا دەبێ بەیەك رێنووس ( رێنووسی سروە) بێ وهەموو چەشنە پاشا گەردانی کۆتایی پێ بهێنرێ ٠

دەبەرنامەی شەوی ئاخردا کاك سەلمان بەرێك و پێکی بەزبانی فارسی وتارێکی بڵاوکردەوە کەبوو بە هۆی دڵگەرمی بەشداران وهیواداریان بەدوا رۆژی روو - ناکی فەرهەنگ وئەدەبی کورد٠

بەیانی رۆژی چوارشەممە دیسان کۆبوونەوە کە درێژەی پێدرا تا بەرهەمەکانی ئەم چەند رۆژە بخرێنە ژێرباس ولێکۆڵینەوە و کەلاڵەیەك لەسەر ئاکامی کارەکان بنووسرێ وبڵاوبکرێتەوە٠ لەسەریەك ئەم خاڵانەی خوارەوە وەك بیرو ڕای خاوەنڕایانی بەشدارلە دانیشتن و کۆبوونەوەکاندا پەسند کران ٠



١ ـ رێنووسی باوی ئەمڕۆ ( رێنووسی گۆواری سروە) دە سەرانسەری کوردستاندا رەچاو بکرێ و هەموو گۆوار و رۆژنامە و کتێب و دەرچوونێك پێویستە بەو رێنووسە بنووسرێ ٠

٢ ـ ئەنجومەن داوا لە هەموو ئەهلی قەڵەمی کورد دەکا بۆپێك هێنانی شێوەی ئەدەبی یەککرتوو هەوڵ بدەن و داواش لە هەموو بنەماڵەیەکی کورد دەکا بۆ پەرەپێدان و بووژاندنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کورد خۆیان بەخوێندن و نووسینی کوردی رابێنن و بەهەر شێوەیەك هەیە فێری کوردی بین ٠

٣ ـ نووسەران و زانایان و شاعیران هەوڵ بدەن زاراوە سەرەکی یەکانی زمانی کوردی ( شێوەی کوردی باکوور ، شێوەی کوردی ناوەراست ، شێوەی کوردی باشوور ) فێربین ٠

٤ ـ ئەنجومەن و بەشداران داوا لە سازمانی رادیۆ، تەلەویزیۆن ( دەنگ وڕەنگ ) دەکەن بەرنامەی خۆیان بەزبانی کوردی زۆرتر بکەن و لە هەمانکاتیشدا زبانەکەیان لە هەڵەوپەڵەو وشەداتاشین بپارێزن ٠

٥ ـ لە رۆژنامەی کەیهان و ئیتیلاعات داوا دەکەین بەشێکیش بۆ زبانی کوردی تەرخان بکا ٠

٦ ـ داوا دەکەین وەزارەت یا ئیدارەی ئیرشادی ئیسلامی نووسراوە وکتێبە کوردی یەکان زۆر رانەگرێ و یارمەتی بدا زووتر بڵاوبکرێنەوە٠

٧ ـ لە ناوەندی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کورد داوا دەکرێ بۆپێك هێنانی کۆنگرەی دووهەم هەوڵ بدا ٠





# دەسکەوتەکانی ئەنجومەنی ئەدەبی بانە

## "تایبەتمەندییەکانی شیعری نوێی کوردی"

"جەلال مەلەکشا"

لەم وتارەدا ، رووی قسەم لە شاعیرانی لاوە، بەتایبەت ئەوخۆشەویستانەی کە بەپێی پێویست ودۆزینەوەی بارستایی وتوانایی زبان ، بۆدەربڕینی مەبەستەکانی خۆیان بواری شێعری نوێ یان هەڵبژارد- ووە. ئەم رێگایە ،رێگایەکی پیرۆزە، بەلام ئەوەی کە من بۆدەربڕینی چەند خاڵی کرینگ سەبارەت بە ئەم مەسەلە هان دەدا ، نامۆیی وبێگانەبوونی هێندێ لەم ئازیزانەیەلەکەڵ تایبەتمەندی یەکانی فەرهەنگ و زبانی کوردی وهەروەها کارتێکردنی زۆری ئەدەبیاتی فارسی وئەدەبیات وفەرهەنگی ئورووپایی لە ئاسەوارەکانیاندایە.

هەڵبەت من دژی ئاشنایی شاعیرانی کورد لەکەڵ ئەدەبیاتی جیهانیدانیم، بەڵکوو پێم وایە پێوندی و ئاڵ و کۆڕی فەرهەنگی وئەدەبی دەبێتە هۆی کەشە-و نەشەی زۆرتر ودەوڵەمەندی ئەدەبیات وهونەری نەتەوەکان. بەلام دەبێ ئەوەش بزانین کە فەرهەنگ و ئەدەبیاتی هەرمیلەتێك بۆخۆی خاوەنی تایبەتمەندی کەلێکە، کەلادان وبایەخ نەدان وبە کەم کرتنی ئەوانە هونەرو ئەدەبیات سست وبێ ریشە وبێ هەوێن و ئامیان دەکا . نامەوێ لە . لك وپۆی ئەم باسەکشتی یە بدوێم ، کاتێ شێعری هێندێ لەشاعیرەلا وەکان دەخوێنینەوە هەرلەیەکەم هەنکاو دا ، پێمان وایە خەریکی خوێندنەوەی وەرکێڕاوی شێعرێکی فارسین.

شێعرەکە، چون لەکەڵ پەروەر دەبوونی فەرهەنگی ئێمەدا بێکانەیە، هەستمان نابزوێنێ وئەم مەبەستە ئەوە دەکەیەنێ کە ئەم شاعیرە بەرێزانە تایبەتمەندی -

یەکانی فەرهەنگی وئەدەبی کۆمەڵگای خۆ یان نەدۆزیوەتەوە، یاکوو شەیدا وئۆگری شەپۆلەکانی شێعری فارسی بوون. وەك مەوجی نەو، مەوجی سێهەم ولەم دوایی یەدا دیاردەیەك وەك "شێعری ناب" و لەم جۆرەشتانە لەسەرەرای ئەوەی نەیانتوانیوە لە شێعری ئەم سەردەمەی فارسیدا جێی خۆیان بکەنەوە، بوونەتە هۆی سەدەمەی شوورەوقەلای ئەدەبی وناوبەناو شاهیدی سەرهەڵدان ولەناوچوونی ئەوجۆرشەپۆلانە دەبین.

من بۆخۆم لەبەستێنی ئەدەبیاتی فارسی دا بەتایبەتی لەبواری شێعروچیرۆك نووسیندا کار م کردووە. لەگەڵ شەپۆلە جۆربەجۆرەکانی شێعری و گۆڕە ئەدەبی و ناقەمەشێعری یەکاندا لە نیزیکەوە ئاشنا بووم وشاهیدی سەرهەڵدان ومەرگی کوتووپڕی دەیان رەوەند وشەپۆلی ئەدەبی لەبواری شێعردا بووم. هەرلە جیغی بەنەفشەوە بگرە هەتا مەوجەنەوەکەی ئەحمەد رەزا ئەحمەدی مەوجی سێهەم وئیستا کە گەیشتوینەتە شێعری ناب.

(هەمیشە لەنێو کێژاوی ئەم پرسیارەدا گێنگڵم داوە کە چۆن هێندێ کەس دەتوانن شێعردابەش دابەش بکەن و لەسەر هەربەشێك ناوێك دابنێن. ئەگەر شێعری نوێ مان وەك سەبك وشێوەیەکی ئەدەبی قەبووڵە، ئەی مانای ئەم سەبك لەنێو دڵی سەبك دا سازکردنەچیە؟).

بەبڕوای من شێعری چاك ورەسەن لەسەرهەرسەبك و شێوەیەك دابهۆنرێتەوە، جێگای خۆی دەکاتەوە. هەر شێعرێك ناوەرۆك وکاکڵی نوێ وتازەی هەبێ شێعر ی نوێیە ومن پێم وایە، ئەم واژەی شێعری نوێ یە، پڕبەپێست وقالبی شێعری سەردەم نیە وئەگەر شێعری ئازادی پێ بڵێین. جێی خۆیەتی. جائەگەر شێعرێکیش خەراپ وناحەز بێ بە هەزاران هەراوهەلاو جەنجاڵ و پڕ وپاگەندە ناتوانێ لە نێودڵی کۆمەڵ دا جێگربێ. لە دەورانی رژیمی پاشایەتیدا هەوڵ و تەقالای دەست وپێوەندەکانی رژیم ئەوەبوو کە بەهەر چەشن وهەر جۆرێك دەبێ شێعری راستەقینەو رەسەن لەگەڵ خەڵکدا دەژیا ولەقوولایی کۆمەڵگاوە هەڵدەقولاو هاواری خەم وپەژارەی خەڵکی چەوساوەبوو، لە خشتەبەرن و لەرێگەی راستی خۆی دووری خەنەوە و بە گورتی شێعری بەرێباز و بەرپرس، لە دەروونەوە پووچەڵ بکەنەوە و مەبەستی هونەر بۆهونەر بکەن بە جێ نشینی. بەم بۆنەوە، رۆژلەگەڵ رۆژ شاهیدی شەپۆلە جۆر بەجۆرەکان بووین. کەسانێك بەدەمامك وبێ دەمامك دەهاتن،خاڵیکی رەش یان لەسەروسیمای ئەدەبیات دەپڕژاندو دەرۆیشتن. من نابێژم ئەوانەی گەلەسەر ئەورێبازانە دەرۆیشتن بە کرێ گیراو ی رژیم بوون. کاربەدەستانی رژیم، خەتیان دەدان و ئەوانیش ،بێ خەبەر لەوپیلانەرەنگاو رەنگانە، خەتەکەیان وەردەگرت وچونکە ئاشنایەکی یان لە گەڵ مێژینە وتایبەتمەندی یەکانی فەرهەنگ وئەدەبیاتی ئێراندا، نەبوو ،زوو هەڵدەخلەتان و وەکوورێبازێکی پیرۆز ونوێ ،پیایادەرۆیشتن، بەلام ئەوەی کە رەسەن بوو. ئەوەی کە پێوەندی قووڵی لەگەڵ فەرهەنگی گۆندا هەبوو، لە جێی خۆی دەمایەوە و درێژەی بە رێگای خۆی دەدا. وەك رێبوارێك بوو کە بە رێگایەکی دیاری کراودا بەرە وئاماتجێکی دیاری کراو هەنگاوی هەڵدەگرت. نەیاران کەند و کۆسپیان لەسەر رێگای دەهاویشت. بەلام رێبواری بە سەبرو حەوسەلە کەندوکۆسپەکانی وەلادەنا وبەرێگەی راستی خۆیدا بۆگەیشتن بە ئامانج دەرۆیشت .ئەورۆش شاهیدی پاشماوەی ئەوشەپۆلە چەواشەو لادەرانەین ودیارە چونکە رەسەن نین و بێ ریشەن لەدرێژە ی رێگادا، لەنەفەس دەکەون وناتوانن بەهانگە هاتك خۆیان بگەیەنن ودەمێننەوە.

شێعری ئازادی کوردیش ،هەر دو چاری ئەم حیکایەتەیە وهەرئەورێگا دەپێوێ کە شێعری ئازادی فارسی پێیدا رۆیشتووە.

گۆران رچەشکێنی بەستەڵەکی ئەدەبیاتی کورد ی بوو، پێش گۆران، شاعیرانی ئۆگری کێشە عەرووزی یەکان خۆیان ودیترانیان دووپاتە دەکردەوە. ئیتر کەس نەیدەتوانی پێی لە جێ پێ نالی و حاجی و مەولەوی دانێ. گۆران دیوارە بۆشەکانی زیندانی شێعری شکاند وسەرەڕا ی ئەوە کە کێشە برگەیی یەکا- نی کوردی زیندوو کردەوە، ئەدەبیاتی رەسەنی لە سەر بنەرەتی گەنجینەی فەرهەنگ وفۆلکلۆری کورد ی

دامەزراند وخستیە سەر ڕێکای ڕاستەقینە وڕێبازی شێعری ئازادی بۆداهاتوان کردەوە. گوابە دوای کۆران شاعیرانی لاوهاتن وچەند کەسێکیان لەسەر ئەورێبازە پیرۆزە وشەی کوردی یان کەیاندە ئەو پەڕی جوانی وبە دنیایان سەلماند کە زبانی کوردی چەند شیاوی خولقاندنی شاکاری ئەدەبی بەشێوە و سەبکی ئازادە ولەم بوارەدا هەنکاوی بەرز و سەرکەوتوانە یان هەلگرت. دوابە دوای کۆران کەسانێك لە کۆڕمپانی ئەدەبیاتدا جلەوی ئەسپی سەرکەشی شێعریان شل کرد وکۆڕژن وحیلەیان کوێی جیهانی ئاخنی. بەداخەوە بە هۆی سیاسەتە فاشیستی یەکانی ڕژیمی پاشایەتی وقەدەغەبوونی وشەی کوردی لەئێراندا، کوردستانی ئێران لەم کۆڕمپانە دا ون و نادیاربوو، بەلام چەند برووسکەیەك وەك سوارەی ئیلخانی زادە وهێندێکی دیکە شەوی درێژی پاشایەتی وپاوانی قەدەغە کراوی ئەدەبیاتی کوردی یان دەشلەژاند وجکەلەوانە، ئیتر ڕێڕەوانی شێعری ئازادی کوردی پتر لەکوردستانی عێراقەوە هەستان، کەلەم وتارەدا، نەماوە ودەرفەتی شی کردنەوەی ئاسەوارەکانیان هەیە ونەئامانجمان ئەوەیە.

ئێمە دێردەستمان پێ کرد، سەرەڕای ئەوەش هەنکاوی بلندمان هەلگرتووە. پێشینەی ئەدەبی زۆربەی شاعیرە لاوەکانمان لەدەسال تێپەڕ ناکاوئەگەر کەم وکووڕی یەك لەکارەکانیاندا وەبەرچاو دەکەوێ هەربەم بۆنەوەیە، بەم حالەشەوە پێشینەی کورتی ئەدەبی ناتوانێ ببێ بەهۆی نامۆیی وبێکانە بوون لەکەل فەرهەنگ وئەدەبیاتەکەمانا...

ئێمە خاوەنی کەلەپوور وفەرهەنکێکی لەمێژینە و پڕلە مەبەستی جوان ونەکوتراو ونەناسراو و نەژاکاوین. سەرچاوەی بەنرخی فۆلکلۆرمان ئەوەندە ی کەنج تێیدایە کە دەتوانێ هەزاران شاعیرو نووسەر وهونەرمەند تێر ئاو وپاراوبکات و بە چلە بۆپەی شانازی یان بکەیەنێ. ڕازی هەرمانی شاعیرانی کەورەی جیهان لەچی دایە؟ جکە لەوەیە کە ئەوان فەرهەنگ وفۆلکلۆری میلەتەکانی خۆیان کردۆتە پالپشت وپشتیوانی ئەدەب وهونەری خۆیان.

هونەری بێ بنج وریشە، هونەری بیژووی بێ پێناسەیە هونەری بێ ریشە وەك میوانێکی بانگ نەکراوە لە سەر سفرەی خەلك کاوێژدەکاوهەر بەم بۆنەوە ڕەسەن نیە، سەرەڕای ئەمانە فۆلکلۆر و فەرهەنکی هەرمیلەتێك خاوەنی تایبەتمەندی کەلێکە کەئەو فەرهەنگ و فۆلکلۆرە لەکەل فەرهەنگ و فۆلکلۆری نەتەوە یەکی-دیکە جیا دەکاتەوە.

شاعیر وهونەرمەندی ڕاستەقینە ئەوەیە کە ئەم تایبەتمەندی کەلەبدۆزێتەوە وبیانکاتە سیما و پێناسەی هونەرەکەی. دەبێ خوێنەر کاتێ شێعرێکی کوردی دەخوێنێتەوە، ئەومەبەستانەی بۆ ئاشنابێ وبیانناسێ وهەستی پێ بکا. بۆنموونە شاعیرێکی کورد بەحێی کەلك وەرکرتن لەد یار دەوسەمبولە کوردی یەکان واژەی زەیتوون، دەئاخنێتە شێعرەکەی ئەوەش بۆ خوێنەری کورد جێی پەسەند و ڕەزامەندی نیە. شاعیری عەرەب، ئەکەر واژەی زەیتوون بەکاردەبا، حەقی خۆیەتی. چونکە زەیتوون لە فەرهەنکی عەرەبدا مانایەکی قوولی هەیە و مەبەستێك رادەکەیەنێ وبۆخوێنەری عەرەب ئاشنایە. یائەو شاعیرە کوردەکەشاعیرێکی بەهرەدار وزۆرباشیشە، لەشێعرەکەیدا، کیتار بە دەستەوە دەکرێت ولەژێر پەنجەرەی دلدارەکەیدا ئاهەنکی ئەوین لێدەدا... هەرچەند ئەم شاعیرە خۆشەویستە بەوێنە کەلێکی زۆرجوان ئەم دیمەنەی نەخشاندووە بەلام، ئایا ئەم دیمەنە، دیمەنێکی کوردی یە. ئەم دیمەنە شاعیرانە، هەرچەند جوانیش بێ لە ئەدەبیاتی کوردیدا، کەلێن وقوژبنێك بۆ خۆی دەدۆزیتەوە.؟!

وێنەکان جوانن. بەلام خۆ نابێ ئێمە جەربی جوانی وێنەکان بین، خوێنەری ئەم شێعرە دەست بەجێ هەست بەنامۆیی لەکەل دیمەنەکە دا دەکا. بۆی قووت نادرێ، ئاشناو خۆمالی نیە...

لایی کردنەوەی ڕووناکبیرانە بەسە، خۆ ڕووناکبیری مانای لادان لە فەرهەنکی میللی نیە. ئەمە لەخۆ نامۆبوونە. ئامرازەکانی مۆسیقای کورد ی لەکەل کیتاردا جیاوازن، هیوادارم وانەزانن مەبەستی من کۆشەکیری وزیندانی کردنی هونەر

وئەدەبـیات لە چوارچێوەی تەسکی ناسیونالیستـی دایە، بە پێچەوانە من پێم وایە شاعیرانی کورددەبێ رووباری هزروبیروئەندێشەیان لەسەرچاوەکانی خاکی نیشتمانی خۆیانەوە هەلقولێ وسەرەرای ئەوەش،لەتەجرەبەی فەرهەنگ وئەدەبی جیهان بۆ پتەوکردنی فەرهەنگ وئەدەبی خۆیان کەلك وەرگرن وعاتیفەی ئینسانی ومرۆڤایەتی یان باڵ بەسەر دنیادابکێشێ... درەختێك کەلە خاکێکی دیاری کراودا رەگ وریشەی نەبێ ولە چاوگە زولالەکان وجۆبارەکانی بنەگای خۆی تێرئاووپاراونەبێ میوەی دروشت وپەسەندناگرێ. وەر ن شێعری شاعیرەگەورەکانی نیشتمانەکەمان بخوێنینەوە .بۆنموونە لە هۆنراوەکانی مەولانادا کوێستانی هەورامان" بە هەموو دیاردە وجوانییەکا - نیەوە، بە هەموو دەردو پەژارە و کامەرانی و ناکامی یەکانیەوە" دەبینین . هەروەهانالی و سالم وجەزیری وخانی و خانا وحاجی ومەحوی وگۆران وهێمن وهەژار و...شێعرەکانیان ئاوێنەی بالانمای زێد ونیشتمانەکەیانە.

شێعری ئازادیش دەبێ ئەم نیشانەکەلە وئەم دیاردەو سەمبولگەلانەی کە پێوەندیی قوولیان لەگەڵ خاك وفەرهەنگ وفۆلکلۆر وداب ونەریتی کوردی دا هەیە بەکار بێنێ. مەگەر نایژین شێعری ئازاد دریژەی مەنتیقی شێعری کلاسیکە؟

بەم جۆرە بۆمان دەردەکەوێ گرینگترین مەسەلەیەك کەدەبێ سەرنجی شاعیرانی لاوبۆلای خۆرابکێشێ مەسەلەی رەسەنایەتی هونەری یە. هەروەهاکەگوتمان هەرزبانێ خاوەنی تایبەتمەندی گەلێکە، کەرەنگە لەزبانی دیکەدا نەبێ.

مەتەڵ وپەند ودەستەواژە وگولواژە ووردەکاری زبانەکان پێکەوە جیاوازی یان هەیە کە هێندێ لەوانە بۆهیچ زبانێکی دیکە تەرجەمە نابێتەوە و لەتەرجەمەدا جوانی خۆیان لەدەست دەدەن.

بەداخەوە،بەوبۆنەوە کە ئێمە لەژێر کارتێکردنی ئەدەبیاتی فارسیدایـن زۆربەی لەشاعیرانی لاومان بیرو ئەندێشە کانیان فارسی یە وهەر چەند بەرێنووسی کوردی دەنووسن رستەکانیان رستەی فارسی یە زۆربەی شاعیرانی کوردستانی عێراقیش دو چاری ئەم گیروگرفتەن و رەنگدانەوەی ئەدەبیاتی عەرەب بیرومێشکیانی داگیرکردووە. بیرکردنەوەیان عەرەبی یە ونووسینەکەیان کوردی" بۆیە کاتێ شێعری ئەوئازیزانە دەبیسین پێمان وایە خەریك خوێندنەوەی تەرجەمەکانی فارسی یاعەرەبین . ئەوە نیشانەی بێ ریشە بوونی هونەرە...نیشانەی ئەوەیە کە ئەو خۆشەویستانە لە تایبەتمەندییەکانی فەرهەنگ وئەدەبی کوردی بێ خەبەرن ونایناسن . بۆیە شێعرەکان پێناسەیان نیە . سیمایان ونە.... پێ یان لە حەوایە وزەوینێکیان بۆرەگ ئاژۆ نیە . ئەگەر شێعری شاعیرێ وەك لۆرکا بخوێنینەوە، هەر دەست بەجێ بۆمان دەردەکەوێ ، شێعرەکەی شناسنا - مەی ئیسپانیایی هەیە... هەروەها شێعری شاعیرانی گەورە وەك نیرودا . مایاکۆفسکی تاگوور ،وشیکسپیر ... ولەعەرەبەکان مەحموود دەروێش ونزار قوبانی و .... هتد... دەزانین ،شێعرەکانیان بالوێزی کام ولاتە. چونکە رەنگ وبۆی ولاتەکەیانیان پێوەیە. تایبەتمەندی یەکانی ولاتی شاعیرەکەی پێوەیە. تەنانەت ئەگەر ناوی شاعیرەکەشی لیی نەبێ خوێنەر لەناسینی ئەونیشتمانەی کە شێعرەکەی لی هەستاوە دوچاری هەلە نابێ. چونکە ئەم شێعرانە لەناخی فەرهەنگ وفۆلکلۆر وتایبەتمەندی یەکانی نیشتمانی شاعیرەکە هەلقولاون.. کەوایە شێعر دەبێ هەویەی هەبێ وهەویەی میللی، پێناسەی شێعرە . شاعیرێکی کوێستانی وشاعیرێك کەلەباشووری گەرم و لێواری زەریادا دەژی وەك یەك بیر ناکەنەوە، لە بابەتی فەرهەنگی یەوە جیاوازی یان هەیە،ئامرازی شێعری یان جیاوازە. شاعیری کوێستانی ناتوانێ لە مەسەلەوان وپاپۆروبەندەروسەییاد ودار خورماوە بدوێ. هەرواکە شاعیری جنووبی لەگەڵ بەفر و کوێستان وداری گوێز وبەروو بێگانەیە... شێعر رەنگدانەوە وزایەڵەی راستەقینە ماددی یەکانە لە زە ینی خولقێنەری شاعیردا . هەرچەند ئەم تاریفە ، تاریفێکی ماددی یە بەلام دوورلەراستی نیە.شاعیر دەبێ دەوروبەری خۆی بناسێ هەستی پێ بکا وتیایا - بژی تاکوو بتوانێ لەشێعردا بیانخولقێنێ. کاتێ دەلێن شێعر راوکردنی ساتەکانە ئەم ساتەزەمانیانە

لەمەکاندان ومەکان غەیرە زئەومەکانە نیە کەشاعیر تێدا دەژی !...

قسەکەمان سەبارەت بە هەویەی شێعربوو.گوتمان هەویەی میللی پێناسەی شێعرە،بەداخەوە ،هێندێ لەشاعیرەکانمان بێ ئەوەی خۆیان ئاگایان لێی بێ . دەکەونە بەند وداوی شەپۆلە چەواشەکان ولەفەرهەنگ و ئەدەبیاتی رەسەن دووردەکەونەوەشێعری سپی یان شێعری بێ کێش، یەکێك لەوبەندوداوە پڕلەمەترسی یا نەیە. من پێم وایە لەنێوان شێعر ونەسردا دەبێ جیاوازی یەك هەبێ. زبانی کوردی زبانێکی ئاهەنگین وکێش داروشاعیرانەیە. ئەوەی کە دەیهەوێ ببێ بەشاعیری کورد ، بە راستی دەبێ زۆر دلێر ، ونەترس وبەهرەداربێت ورۆژلەگەڵ رۆژبۆ پێش بردن و گەشە پێدانی بەهرەکەی هەوڵ بدات . چونکە لەوڵاتێکدا کە شوانەکانی شاعیرن دروێنە - کەران شاعیرن . دایکەکان شاعیرن .جووتێر و گاوان، تەون کەروشەنگە بێری یەکانی شاعیرن ، شاعیری کارێکی دژوارە.

گوتمان ، زبانی کوردی لە زاتی خۆیدا ، زبانێکی ئاهەنگین وکێشدارە وئەوەش یەکێك لەتایبەتمەندی - یەکانی بەرچاوی ئەم زبانە شیرینە یە. کەوابوو ، لادان ووەلانانی ئاهەنگ ووەزن لە شێعردا ،بەمانای مەرگی هونەری یە. مەبەستم خۆماندووکردن لەسەر کێشە عەرووزی یەکان نیە. ئەدەبیاتی کوردی بۆخۆی خاوەنی کێشی تایبەتی یە.. ئەوەی کە لەشێعری فارسیدا وەك مەوجی نەو ومەوجی سێهەم وشێعری ناب بۆتە باو، ناتوانێ لەشێعری کوردیداجێگایەك بۆخۆی بکاتەوە وهەوڵدانی هێندێ لەخۆشەویستانی چەواشەی رێگای شێعر لەسەر ئەم رێبازە ئاکامی نیە وبەوێنەی ئاولەبێژنگ کردنە. ئەوەش بڵێم من ئەگەر بەتوندی شێعری سپی وشێعری ناب ومەوجی نە و لەشێعری کوردیدا ، رەت دەکەمەوە، هەرگیزمەبەستم وەلانانی وێنە، لەشێعردانیە . من دەڵێم ئەگەر هەزار وێنەی دڵڕفێنیش لە پەخشانێکدا کۆببنەوە ، پەخشان ناکەن بەشێعر هەتا ئاهەنگ ووەزنی پێ نەدرێ بەتایبەت لەکوردیدا .. من پێم وایەشێعرێك کەوێنەی تێدانەبێ ئەوشێعرەشێعرێکی سەرکەوتوونیە .

رەنگە هەرنەتوانین ناوی شێعری لەسەر دابنێین ، تەنانەت ئەگەر وەزن وسەروایشی هەبێ.. وێنە پێویستی شێعرە ،شێعری بێ وێنە ، دەستەواژەیەکە خاڵی وپووچەڵ وبێ رۆح.. وەك تەرمێکی بێ گیان...

وێنە رۆح وگیانی شێعرە.. ئێوە بڕواننەشێعرەکانی گۆران، سوارە، پەشێو، هەڵمەت وشێرکۆبێکەس و رەفیق سابیروئەنوەرقادرمحەمەد .. ولەفارسەکاندا نیما ، شاملو، سپێهری ،ئەخەوان سالس و فەرۆخزاد شێعری ئەوشاعیرە بەرێزانە پڕلەو ێنەی جوانن و سەرەرای ئەوەکێش وئاهەنگ وزەبراهەنگیشیان هەیە و لەبەرانبەر شەپۆلەهەڵەکانەوە رێگایان لێ ون نەبووە، راوەستاون ورێگای خۆیان بۆکەیشتن بەئامانجەبەرزە - ئەدەبی یەکانیان درێژە داوە. بەتایبەتی شێعری ئازادی فارسی ...

خاڵێکی گرینگی دی کە بە پێویستی دەزانم ئاماژەی بۆبکەم ،نەبوونی سەربەخۆیی فیکری وزبانی لەنێو هێندێ لەشاعیرە لاوەکاندایە. شاعیرە لاوەکانمان جگە لەچەند کەسێ کە پێشینەی پتریان لەشێعرداهەیە وزبانێکی نیزیك بەسەربەخۆیی یان دۆزیوەتەوە... بەداخەوە، هێشتا نەیانتوانیوە سەربەخۆیی فیکری وزبانی بۆخۆیان دابین بکەن . ئەم جەماعەتە ئەگەر بیانهەوێ دەتوانن بەسەربەخۆیی ئەندێشە وزبان وشێوەی دارشتنی شێعربکەن،بەلام پەیرەوی لەکەسانێك دەکەن کە خۆیان زۆر رەخنەیان لەسەرەولەبەستێنی شێعردا ، لایەنەبێ بێ هێزەکانیان بەسەر لایەنەبە قووەتەکانیاندا زاڵە.

من کەرەکم نیە ناوی کەس ببەم ئەو رۆکەسانێك بە هۆی پروپاگەندە وەك شاعیرانی گەورەونوێخواز ی کورد ناسراون وناوبانگیان دەرکردووەوبەداخەوە سێبەری گرانیان خستۆتەسەر شێعری لاوەکانمانا ، دەبێ شاعیرەکانمان هەوڵ بدەن بەبێ پاڵپشتی دیتران رێگای خۆیان هەڵبژێرن وزبان وئەندێشەی تایبەتی خۆیان بدۆزنەوە. من دەڵێم خۆمان بیربکەینەوە. فکر و هزروهەستە راستەقینەکانی خۆمان لەقالبی شێعرادا برێژین. شێعری سەربەخۆ ئەگەریش بێ هێزبێ ، رەسەنە وپێناسەی هەیە .

ئیترسەرکەوتووبن



# شیری دایك

سەعادەت ساڵحی

شیری دایك لە سەروی هەموو ئەو شیرانەیە کە وەك خواردن دەدرێتە منداڵی تازە لە دایك بوو . چونکە شیری دایك خواردنی زۆر سووکە و پاکە لە هەموو جۆرە میکرۆب و بەکتریەکی بێ سوود و گەرماییشی دەگونجێ بۆ میعدەی منداڵ .

ئەو مندا ڵانەی کە بە شیری دایکیان گەورە دەبن دوورن لە نەخۆشی ئەستوور بوونی ریخەڵۆك و سنگ و گەروو . ئەو نەخۆشیە پڕ مەترسی یانە لە وڵاتە دوا کەوتووەکاندا زۆر بە دی دەکرێ .

شیری دایك ڤیتامینی A و D ی زۆر تێدایە کە لەشی منداڵ پێویستی پێ هەیە تا تەمەنی دەگاتە ( ٦ ) مانگ و ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە منداڵەکە تووشی کەم خوێنی نەبێ و نیسبەتی تەسك بوونی دەمارەکانی خوێن و قەڵەوی کەمتر تووشیان بێ لەو مندا ڵانەی کە بە شیری دایکی خۆیان گەورە ناکرێن ...

شیری دایك کارێکی گەورەی بۆ هەست و دەروونی منداڵ هەیە و دەبێتە هۆی بە هێز کردنی خۆشەویستی دایك و منداڵەکەی و زیاتر دایکەکە پەرۆشی دەبێ بۆ پەروەردە کردن و بە خێو کردنی .

لەم دواییەدا ئیسبات بووە ئەو مندا ڵانەی کە بە شیری دایکیان گەورە دەکرێن لە باری تەندروستی لەش و دەروونی یەوە زۆر ساغ ترن لەو مندا ڵانەی کە بە شیری دایکی خۆیان گەورە ناکرێن . هەر وەها بۆ زاناکان روون بۆتەوە ئەو ئافرەتەی منداڵەکەی بە شیری خۆی بە خێو دەکا ماوەی بەینی دوو سکی زیاترە لەو ئافرەتەی منداڵەکەی بە شیری خۆی بە خێو ناکا ، هەمیشە ئەو جیاوازی یەش کار دەکاتە سەر تەندروستی دایك و پەروەردەکردنی منداڵەکەی .

پاش ئەو کورتە باسە دەبێ رەچاوی هەندێك حاڵەت بکرێ و بە وریایی شیری بدرێتێ . لە حاڵەتی نەخۆش بوونی مەمك و ئەستوور بوونی گورچیلە و وەرەم و ناخۆشی دەروونی، دایك نابێ شیری بداتە منداڵەکەی .

ئەگەر پاش منداڵە تازە بووەکەی سکی پەیدا کرد دەبێ شیری لە منداڵەکەی کەم بکاتەوە تا سکی دەگاتە هەفتەی بیستەم ئەو وەختە نابێ شیری خۆی بداتێ .

ئەمەش چەند ئامۆژگارییەك بۆ ئەو دایکانەی بە شیری خۆیان منداڵەکانیان بە خێو دەکەن :

پێویستە دایك بزانێ کە منداڵ گەورە کردن بە شیری خۆی سوودێکی چەند زۆری هەیە و دەبێ بە ئیشتیا و عەلاقەوە شیر بداتە منداڵ ... چونکە بچووکترین نەخۆشی دەروونی دایك لە سەر منداڵەکەی رەنگ دەداتەوە و ئەنجا مەکەشی بێ سوود دەبێ .

پێویستە دایك خواردنی چاك و بە سوود بخوا و خۆی زۆر برسی و ماندوو نەکا ئەگەر تووشی هەر نەخۆشی یەك بوو بە زووترین کات چارەسەری خۆی بکا و نەیخاتە پشت گوێ .

تا مانگی سێ یەم منداڵ زۆر شیری پێویستە و باشتر ئەوەیە تا مانگی حەوت و هەشت بەردەوام بێ و ئینجا وردە وردە تا دوو ساڵی لێی کەم بکاتەوە .

بە تاڵ بوونی شیری مەمك بە زۆری دەکەوێتە ئەستۆی منداڵ .

پێش منداڵ بوون بە چەند هەفتەیەك پێویستە دایکەکە رۆژێ جارێك یان دوو جار مەمکی خۆی بگوشێ بۆ ئەوەی ئەو شیرەی هەیە لە ناو مەمکەکە بێتە دەرەوە . چونکە پاش منداڵ بوون مەمکی دایك ئەستوور دەبێ و ژان دەکا ئەمەش کار دەکاتە سەر شیردانی منداڵ .

پێویستە تاو تاو ئاگاداری قورسایی منداڵەکەت ببی تا بزانی چەند شیر دەخوایان ناخوا .

لە و( ٥ تا ١٠ ) دەقیقە دەبێ منداڵەکە جێ گۆڕکێ بکەی لەو مەمك بۆ ئەو مەمك بەڵام لە هەموو حاڵەتێکدا نابێ لە ( ٢٠ ) دەقیقە زیاتر بێ .

هەمووە هەڕەشە و گوڕەشەوە بە ئاکام نەگەیشتی دەگەڵ منداڵێکی ساوات پێ نەکرا و دەرەقەتی نەهاتی و نەت توانی پەنجەنانەکەی لە دەست دەرێنی جا بزانە کار بە زۆری ناکرێ • دەبێ بە نەرمی و بە ئارامی بە خۆشی و ئەسپایی کار بکەی و بە ئامانج بگەی جا چاوت لێ بێ نۆرەی منە •

خەو ئەوا هێدی هێدی، زۆر لە سەرە خۆ ، بە ئەسپایی بێ تەقەو شەقە بۆ لای منداڵەکە چوو دایکی منداڵەکەی لە کار کرد و هات منداڵەکەی لە باوەش خۆی گرت و خستێ سەر کۆشی خۆی بڕێکی بە خۆیەوە کوشی و مە ساچی کرد و مەمکی دەزاری نا و دەستی کرد بە لایێ لایێ و پێی هەڵدەکوت :

**هەی لایە لایە رۆڵە لای لایە**
**بنۆ درەنگە بۆ خەوت نایە**

**رۆڵە رووناکی گلێنەی چاوم**
**بەندی جەرگ و دڵ هێزی هەناوم**

**ریحانەی بۆن خۆش سوورە گوڵەکەم**
**ئاو پریشکێنی کوڵی دڵەکەم**

**چۆڵەمەی ئەستۆم رەنگی حەیاتم**
**هەنگوین و قەند و نوقڵ و نەباتم**

**خەوی خێرت بێ بنوو درەنگە**
**تاکە لەبا بی بەیان بێدەنگە**

**هەی لایێ لایێ رۆڵە لای لایە**
**ئەو شۆ بەزەییت بە مندا نایە**

**زێر بەوە رۆڵەی زێر و جووانم**
**لە بەر ئەو بایە دەگری دەزانم**

دایك وردە وردە دماندووی منداڵەکەی حەساندەوە منداڵەکە ژیر بۆوە چاوی ئەستڕی دەسرەی بە روومەتی داهێنا و کەم کەم منداڵەکە چاوی لێك نا و ملی بەرداوە و خەوی لێ کەوت • بەو خەوە شیرنە منداڵەکە نانەکەی لە دەست بەربۆوە کە با بەو هەمووە هێز و توانایەوە کە دەریای دەشڵەقاند نەیتوانی نانەکەی لە دەست منداڵەکەی دەرێنێ •





# ڕێنوێنی ئەدەبی

شێعروەك هەر دیاردەیەكی دیكە لە حاڵی پێشكەوت وئاڵ وكۆڕدایە، هەرچەند زەمان دەچێتە پێش وزانست وزانیاری كۆمەڵ بە تایبەت رووناكبیران بەرەو ژوور دەچێ شێعروبۆچوون سەبارەت بە شێعریش ئاڵ وكۆڕی تێدابەدی دەكرێ • كەسێك كە بیەوێ ببێتە شاعیرێكی سەركەوتوو ،دەبێ پلەی ئەدەبی شێعری هاوچەرخی هاتبێتە دەست و هەول بدا بەرە بەرە لەوپلەیەش سەرتربڕوا وجێ پێی خۆی دیاری بكا • كە شێعری شاعیرێك دەخوێنینەوە نابێ خێرا شێوەی كوتن وسەبك وتەنانەت نێوەرۆكی شێعرەكانی شاعیرێكی دیكەمان بێتەوەبیر • مامۆستا هێمن لە بارەی ئەو شاعیرە لاوانەوە كەلاسای یەكتر دەكەنەوە لەكتێبی "ڕێ ی نان بكرن" لاپەڕەی ٤٦ دا دەفەرمێ:

" ماوەیەكە شێعری شاعیرە لاوەكانمان ئەوەندە و یەك دەچن پیاو هەربە ئیمزای شاعیرلێكیان دەكاتەوە" شاعیرانی لاودەبێ ئەو پرسیارەیان بۆبێتە پێش كە لە حاڵێكدا تائێستا نیزیك بە چەند سەد شاعیربگرە زیاتریش ، بۆمەلە كردن لە دەریای شێعردا پەلەقاژە -یان كردووە، بۆچی تەنیا بەژمارەی ئەنگوستەكان بوونەتە مەلەوانێكی كارامە وشەپۆلەكانیان دەستەمۆ كردووە؟ ئەو چەند كەسە چیان كردووە و چۆنیان نووسیوە كە بەوپلەوپایە گەیشتوون وئەوانی دیكە چۆنیان نووسیوەكە وەك كۆڵە شاعیر ماونەوە ؟ دۆزینەوەی وڵامی ئەوپرسیارە،دیتنەوەی ڕێگای سەركەوتنە، ئەوان لەچ بارودۆخێكدا چیان كوتووە و ئێمە كە هەم ئەزموونی شێعرەكانی ئەوانمان لەبەر دەست دایە وهەم ئەدەبیاتێكی دەوڵەمەندترمان هەیە دەبێ ح بكەین هەتا خولقێنەر بین نەك لاساكەرەوە؟

لە ڕێنوێنی ئەدەبی ئەو ژمارەیەدا دەمانەوێ باسی ئەوشێعرانە بكەین كە وەرزی كوڵ كردنیان بەسەرچووە ، بەڵام ئێستاش ژمارەیەكی زۆرلە لاوان خەریكن بە دەوری دادێن وراستە ویاسنەی دەكەن• وەزنی بۆدادەنێن قافیەی بۆهەڵدەبژێرن وبۆتەمەی دەگێڕن. ئێمەش چاپیان ناكەین وهۆی دڵ ئێشی خاوەنەكەی پێك دێ •

وەك نموونەیەك بۆئەوبابە كوڵلی بە شاعیرەیەك بە شێعری شاعیرانی پێشوودا دەكەین،دەگەڵ شێعری ئێستای هەڵدەسەنگێنین:

لەلاپەڕەی ٨٥ ی كتێبی "چوارباخی پێنجوێن"ی مامۆستا قانع‌دا لە شێعرێكدا بە نێوی "یەك دواندنی وریا و خەنجەر كوڕی قانع "دا نووسراوە :

| "وریا" | "خەنجەر" |
|---|---|
| ئەی كوڕ نەوەی كێی؟ | نەوەی شێرانم |
| تۆلەكام هۆزی ؟ | هۆزی كوردانم |
| .................. | ............... |
| نەخۆشینەكەت ؟ | جەهل ونیفاقە |
| دەرمانی دەردت ؟ | هەر ئیتیفاقە |
| پشت وكۆمەكت؟ | علم وزانینە |
| قەڵا وقەڵاچكەت ؟ | سیدق ویەقینە |
| سێبەری سەرت ؟ | دیواری مەكتەب |
| تۆشەی غەریبیت ؟ | ئەخلاق وئەدەب |
| .................. | ............... |

ئەو شێوەشامۆژگاری یە (بەنەزم) لە قۆناخێكی تایبەتی ئەدەبیاتی كوردیدا جێگای خۆی كردۆتەوە و لەلایەن كۆمەڵیشەوە وەركیراوە•جگە لەمامۆستاقانع شاعیرانی دیكەش شێعریان پێ وتووە• ئێستا ئەگەر كەسێك ئاوا راستە وخۆلەدەرد بدوێ قسەكەی بە شێعر ناناسرێ، تەنانەت ئەگەر لەباری وەزن وقافیەوە زۆریش ڕێك وپێك وپتەوبێ•

بۆوێنە لە لایەن مەلای بەڕێزی گوندێكەوەشێعرێكمان پێ گەیشتووە كە وێڕای سوپاس لە هاوكاری یەكەی

لەژێرەوە چەند بەیتێك لە دەقی شێعرەکە دەنووسینەوە :

**کوڕی باش وئەمەکناس و حەیابی**
**دەبێ کەلکی هەبێ بۆ دای وبابی**

**هەموو دانیشتن وهەستان وکاری**
**کەم وزۆر هەر قسەیەك دەردێ لەزاری**

**ئیجازەی بێ ونەکا قەت کاری ئاوا**
**بەبێ پرس وئیزن قامك بە ئاوا**

**بەرێ وشوێنی ئەواناوەك منالّی**
**بچێ وبیرکاتەوە کاتی منالّی**

**بکادووری لەبێ ئەمری وئەوانە**
**بە جێ بێنێ ئەوەی ویستی ئەوانە**

ئەوشێوە ئامۆژکاری یە سەرەرای ئەوەیکە بۆکۆمەڵ پێویستە بەڵام دەتاریفی شێعردا ناگونجێ، دەکرێ بە نێوی نەزمێکی جوان ناوی ببەین بەڵام هەر وەك دەزانن نەزم وشێعر تاریف گەلی جیاوازیان هەیە.

هەروەك کوتمان ئەوباسە کوللی بەوتەنیا پەند و ئامۆژکاری ناگرێتەوە، ئێستا دەربڕینی هەستی نەتەوایەتیش بەشێوەی سەمبولیك باس دەکرێ.کاتێك کە ئێمە لە ڕێنوێنی ئەدەبیدا دەڵێین لەدروشم دان لە شێعردا خۆبپارێزن مەبەستمان ئەوەیە کە دەبێ نێوەرۆکی شێعرەکەتان بتوانێ مەبەستی ئێوە بکەینێ ،

مامۆستاهێمن لەوشاعیرە بەرزانەبووکە باری ئەدەبی شێعری کوردی دەزانی .ئەگەر بۆ وێنە لەساڵی ١٣٤٧ داهۆی ئاوارەیی بەوچەشنەی خوارەوە (کەزۆرتر باری دروشمی هەیە) دەردەبڕێ:

**"ڕەق هەڵاتم"**

**من لە داخی خزمی خوێری وئاشنای ئەحمەق هەڵاتم**
**من لە ترسی زاق وزووقی ئەمنیەی چاوزەق هەڵاتم**

**کوا بە خۆشی خۆم بەجێ دێڵم وڵاتی خۆشەویستم ؟**
**من لەترسی زللە وباتووم و دارو شەق هەڵاتم**

**هەربە پێ یان و بەکۆمە کۆم کەیمە ئەم وڵاتە**
**رەنگە پێت وابێ بەسواری مایەنی گوێ لەق هەڵاتم**

.........................

بەڵام پاش ماوەیەك ئاوارەیی وپێشکەوتنی باری ئەدەبی وبە دەست هێنانی ئەزموونێکی سی ساڵە لە دەریای شێعرو ئەدەبیاتدا ، کاتێك کە باسی "بێ پەرستاری" و تەنیایی ورابردووی خۆی دەکا ،ئاوا مامۆستایانە شاکار دەخوڵقێنێ :

**"عیشقی ئازادی"**

**ئەگەرچی ئەو درەنگە ساقی بۆم تێکە کەمێکی تر**
**کەوا ئەمشەو سەری هەڵدا لە ناخەدا خەمێکی تر**

**لە بادە ئەم ژەمە تێرکە منی تینووی جگەر سووتا و**
**بەچی دیارە کە دەیبینم ئەوێکی تر ،ژەمێکی تر !**

**ئەوەندە دەردەدار وبێ پەرستارم کە پێم وایە :**
**لەمەرگێکی تەمەن هەڵناکرێ تازە ئەمێکی تر**

**گەلێکم ڕۆژگاری تاڵ وشیرین ڕابوارد ئاخۆ**
**ئەرگەمەودا دەدا دیان ببینم سەردەمێکی تر !**

یالە پاش گەڕانەوە بۆزێدونیشتمانی خۆی ولە کاتێکدا کە دوایین قۆناخەکانی ژیانی تێپەردەکرد :

**بارگەیان تێکەوە پێچاو بەرێ بوون یاران**
**لەمنێ وابە تەنێ پاشی ئەوان من چ بکەم ؟**

**ژیانی من ئێستە وەکوو خۆری دەمی زەردەپەڕە**
**پێم نەماتین وگوڕ و هێز وتەوان من چ بکەم**

لەوسەروبەندەدا ئاوابە سۆز وشاعیرانە لاوەکان بۆ پاراستنی "سروە" هان دەدا ودەڵێ:

**سروەهات خونچە گوڵی باخی ئەدەب پشکووتن**
**باخەوانی گەرەکە تازە جەوان من چ بکەم**

**ئاونەبوو ئەو دەمی هێمن مەلەوانی کورد بوو**
**ئاوشوکر زۆرە وەرن زووەمەلەوان من چ بکەم**

ئەوە نەسیحەت وهان دانە ، بەزمانێکی شاعیرانە:

بەڵام بڕواننە شێعری "هیوا وهومید"کاك "ر . ئەلف" :

**هیوا وهومێدی ڕۆژی ژین**
**ڕۆژی زار بە بزەی شیرین**

**ڕۆژی شادی و پێکە نین**
**ڕۆژی سەیران وهەڵپەڕین**

**ڕۆژێکی وە ها هیوامە**
**گەردەڵێیت ئەورۆژە کامە**

ڕۆژێکــە کە ژیــنـــی مـــــرۆڤ
دووربێــت لە داغ وئاه وئـــۆ ف

دووربێ لـە نــاسـۆر وگـریــــن
هـەمـوویـەکـــان وەك یـەك بژیـــن

ئێمەش ڕۆژێکی ئاوامان پێخۆشە وچاوەڕوانی هاتنیشی دەکەین. بەڵام لە دونیای شێعردا بەوشێوەیەی بــا س لێ ناکرێ .

ڕەنگە نەسیحەتی چاك بێ، پەندبێ ، هاندەربێ ، دروشم بێ، نەزم بێ، بەڵام شێعرنییە.

ئەگەر بمانەوێ لە کۆتایی ئەوباسەدا نەتیجەیەك لەقسەکانمان وەربگرین دەبێ بڵێین کە شاعیری هاوچەرخ بۆئەوەی بتوانێ شاعیرێکی سەرکەوتووبێ دەبێ هەر لەسەرەتای دەست پێکردنی شێعرەوە هەوڵ بدا بۆ ئەوەیکە وردە وردە پلەو پایەی شێعری ئیمرۆی بێتە دەست. دیارە کەس لە بەرەتاوە شاکاری نەخوڵقاندووە بەڵام پیاوە گەورەکان هەرلەسەردەمی منداڵی یەوە بۆ پێگەیشتن هەوڵیان داوە ورەخنەیان سەلماندووە و دەوروبەری خۆیان ناسیوە ولەهەمووی گرینگتر ئەوەیە کە ئەوان ماندووبوونیان نەناسیوە .

ئێمەش ئەوچاوەڕوانی یەمان لەشاعیرانی لاونیە کە هەر قەڵەمیان بردەسەرکاغەزێ گەوهەری لێ ببارێ . ئەوشتانەی ئێمە دەیڵێین شوێنێکە کە بۆ بەرەوپێش چوونی ئەو بەڕێزانە دانراوە وبۆئەوەیە کە لەسەرەتاوە بزانن بەرەو کوێ دەچن. هەوڵ بدەن وموتا ڵابکەن.نیمایووشیج شاعیری گەورەی فارس لە پێشەکی کتێبێکدا دەڵێ تەنیا پێشنیاری من بۆ لاوان ئەوەیە کە بخوێننەوە دیسان دووپاتی دەکەمەوە بخوێننەوە. دیارە کە ئێمەش ئەو قسەیە دەقۆزینەوە ولە هەمووی ئێوە هۆکرانی ڕێتوێنی ئەدەبی داوا دەکەین کە ئەگەر دەتانەوێ سەرکەوتووتربن باشترین ڕێگائەوەیە کە هەتا دەتوانن شێعرورەخنە وهەرباسێك لە ئەدەبیات کە وەدەستتان کەوت بیخوێننەوە.



( بدون شرح )




○ خزمەت بە فەرهەنگ وئەدەبی کوردی ئەرکی سەرشانی هەموومانە . ○



# پەیمان

محەمەد سادق ئیسماعیلزادە

دایە پیرە و باوەپیرە، هەر لە رۆژی هەوەڵەوە بەڵێن و پەیمانیان بەیەك دابوو هەتا مردن یەکتر بەجێ نەهێڵن.... جاهەر لەبەر ئەوە خەڵکی ئاوەدانی نێوی تاقانەکەیان نابوو "پەیمان".

شەوێك کاتی نوستن دایە پیرە بە "پەیمانی" گوت :

- رۆڵەی شیرینم تۆشوکور گەورە بووی ئیدی دەبێ لە پووشکەووشکە ڵ کۆکردنەوە دا یاریدەی بابت بدەی.

پەیمان زۆر بە ناقایلی لێفەکەی کێشا بەسەرا وگوتی :

- نەخێر ،من پێم خۆشە، ئەوەی ئیشتیای خۆمەبیکەم !

دایە پیرە زۆر نارەحەت بوو، رووی کردە ئاسمان و گوتی:

- خودایە زۆر شوکرت ! هەر بۆخوت باش دەزانی !

ئەو شەوە لەنیوەشەودا دێوێك چووەبن هەنگڵی پەیمان وگوتی :

- وەرە بالێرە بڕۆین ، بچین بۆ شاخی ، لەگەڵ باڵندەکان هەڵفڕین وراوبکەین و بەکەیفی خۆمان رای دەمێنٌ دایە پیرەش دیار نیە بتنێرێ بۆوشکەڵ کۆکردنەوە.

پەیمان ، فریوی خواردو وەدوای دێوکەوت بەلام لە شاخی هیچ باڵندەیەك وەخۆی نەگرتن ، گوتیان :

- دەبێ هێلانە سازکەن ، جائێمە دەتان بەین بۆ ئاسمان و راو.

پەیمان هات بڵێ : باشە.

دێوە گوتی : - ئەوە ئێمە لە دەست کار هەڵدێین ، ئەوانە خەریکن خانووبەرەمان پێ سازدەکەن ، وەرە با بڕۆین بۆ دەریا...

رۆین بۆ دەریا ، لەوێ دەگەڵ ماسی یەکان دەستیان کرد بەمەلەکردن



رۆژێك ماسی یەكان گوتیان :

- باجۆماڵ وپاك وخاوێنی دەریابكەین.

هەرماسی یەك خەریكی كاری بوو

پەیمان هات بڵێ - بائێمەش یاریدەیان بدەین دێوە گوتی : - خۆت بە خۆرایی بۆ ماندوو دەكەی . وەرە بابرێك سواری ئەسپی ئاوی بین .

ماسی یەكان كە ئەوەیان بیست گوتیان :

- ئێرە جێگای تەمبەڵی نیە، یالڵا برۆن بۆ دەرەوە.

دێو گوتی : دەی سا دەچین بۆجەنگەڵ، لەوێ هەموو وەحشین و قانوونێك نیە ، بەكەیفی ئێمەیە .

لە جەنگەڵ چەند رۆژێ میوانی شێری فەرمانرەوا بوون . دێوە و پەیمان لە خۆشیاندا پێ یان وەعەرزی نەدەكەوت ، پێ یان وابوو هەر ئاوا دەتوانن رایدەن رۆژێك دێوە دارێكی ئاوردا ، بۆ ئەوەی بە پەیمانی بڵێ ئەوە نەورۆز نیزێكە !

بەو كارە تەواوی جەنگەڵەكە وەبەر ئاور كەوت .

شێر لەبەر ئەوەی حورمەتی میوان راگرێ گوتی :

- قەیدێ ناكا وەرن بابە ئاو وخۆڵ وئەوانە بیكووژێنینەوە..

هەرچی حەیوانە كۆ بوونەوە و دەستیان كرد بە كووژاندنەوەی ئاو رەكە.

پەیمان هات یاریدەی حەیوانەكان بدا دێوە گوتی :

- كورە ، ئەوە چ دەكەی ، بۆخۆت ماندو دەكەی . خۆ جەنگەڵ هی ئێمە نیە . وەرە بابەو ئاو رە چەند گەنمە شامی ببرژێنین .





شێر کەئەوەی دی وئەو قسانەی بیست ٠ خوێن بەرچاوی گرت و بەتوورەیی یەوە گوتی :

- ئەوە بۆ هیچ ناکەن ٠

دێوە گوتی : - ئێمە بۆیە هاتووین بۆ ئێرە بەکەیفی خۆمان رایدەین ٠

شێر ئیدی خۆی بۆ رانەگیرا وگوتی :

- کەیفی منیش وایە هەر دووکتان بدەم ئاورە بکەمە کەباب ٠

بە دوای ئەو قسانەدا شالاوی بۆ دێوە و پەیمان برد، هەر دووکی خستە نێو ئاورەکەوە ٠ دێوە دەست بەجێ بوو بە دووکەلّ وغەیب بوو٠ پەیمانیش دەستی کرد بەهەڵبەز هەڵبەز و ئەی هاوار ! ئەی هاوار ! دایەگیان سووتام کوتن ! کافر بۆی موسلّمان دەبوو٠

دایکی لێفەکەی لەسەر لابردوگوتی :

- بیسمیلا ، بیسمیلا ! ئەوە چ بووە٠٠٠٠ ئەوەبۆ لاقە فرکە دەکەی ؟! هەستە هەستە و لات رووناك بۆتەوە٠

پەیمان هەرکە چاوی هەڵێنا ، خۆی هاویشتە باوەشی دایکی وگوتی :

- درەنگە دایە گیان ، بابچم یاریدەی بابم بدەم ٠

دایکی بەسەر سورمانەوە گوتی :

- خودایە زۆر شوکور هەر بۆخۆت چاك دەزانی ٠

" تەواو "

---

# منداڵ ، گوڵی پشکوتووی باخچەی ژیانە

ئازیزەکەم
هەستە بڕۆین لەم دیارە
بڕۆینە ئەو پەڕی ون بوو و نادیاری
بڕۆینە ناو رووباری ڕێی ئەویندارى
هەستە بڕۆین
هەستە هەتا کوو بۆ یەك دەم
کەوی ژیان دەستەمۆ کەین
با بۆ تاقە جارێکیش بێ
تێر لە قاقای پێکەنین بەین
هەستە بڕۆین
من خۆم ئاگام لە تۆ دەبێ
بۆ پێی بچووك و نەرمی تۆ
چاوەکانم دێنمە ژێر پێ
گەر بێت و بێ
لە ناو بێشەی باوەشمدا رات دەژێنم
بە جێی شنە بەئەنگوستم قژی خاوت دادەهێنم
هەر چی لەعەورانی سەختی ژیانت دا
داخوازی خاوەنی بکەی
سووك و هاسان
لە ئەوپەڕی ئاسۆی ون بوو بۆت دەهێنم
هەستە بڕۆین
بێت و نەیەی
بێت و مەست نەبی بەم جامە مەیەی
وەك شەمی عاشق من دەتسووتێنم
لە سەر تەرمی سووتاوی بێ گۆڕ و کلکۆ
لەشی سووتاو رادەژێنم
بۆ مەرگی تۆ
هەستە بڕۆین
روونی ئاسۆ بۆ ڕێبینی من و تۆیە
مانەوەمان مەرگ و نەمان وڕۆیە
هەستە بڕۆین
با تێر بڕۆین

ئەمیر جاوید «غەریب»




## «دۆزینەوە»



لە چاوەڕوانی دوێنێم دا
دەم بزرکاند :
" رووگەی منی - بەڵام ونی
بۆ دیتنەوەت
شاری گەورە و
چیای چۆڵم - پاك پشکنی "
لە بەختیاری ئەمڕۆکە شا
هاوار دەکەم :
" تۆ شیرینی - فریشتە خووی
باشتر لە زووی
باش دەزانم بەرەو کوێ چووی
کاتێ لە چیا و
چۆل و شاران
ناهومێد بووم
سەیری دڵی شەیدای خۆم کرد
لە ڕێدا بووی

ک.د. ئازاد. بانە




کوێلـە بـووم کوێلـەی هەمیشـەی ، هێنـدە رارایـی نەبـا
هـەر زوێنـی داوی ئەشقـی ویم لەخۆبـایـی نـەبـا

تـاقە پـەروانـەی پـەرِ و بـاڵ هەڵـوەریـوی دەوری رووی
من دەبـووم مـن ، گـەر شـەمـی هەر کـۆڕی ئـاسـایـی نـەبـا

ئـاوێنـەی ژینـم گـەلـێ رووخـۆش دەبـوو و دونیـا نـوێن
گـەر بـە ژانـی بـێ وەفـایـی ، ژەنگـی بینـایـی نـەبـا!

خـۆری هیـوای ، رۆژی وەصـڵـی کـەی لـە دڵ ئـاوا دەبـوو
دا جـودایـی ، بـۆ ژیـان ، شـەوگـاری تەنیـایـی نـەبـا

پـاشـی خـۆی ، ئێستـا خـەمـی ، شیـاوی هەڤاڵی بیتـووم
چـۆن شیـاوی ئـەم خـەمـەی بـام و بـە خـۆم شـایـی نـەبا

دەوڵـەمـەنـدی گـەنجـی عیشـق بـووم و سـامـانـم هـەبـوو
رەنجـی مـن کێشـام لـە پێـی بـێ سـوود و خۆڕایـی نـەبـا

خـۆ دەزانـم قـەت بـەهـاری بـێ خـەزان نـەبـووە بـەڵام
خـۆزگـە " بـۆران " ئـەو بـەهـاری عیشقـە کـۆتـایـی نـەبـا

نادر نیروومەند «بوران»

## نیوە شەو

نیـوەشـەوە و
تـەنیـا و بێـدەنـگ
ئەشکـی خـەفـەت
بـە گـۆنـام دا
دێتـە خـوارێ
پەنجـەرەشـم
لـە نـاو کـۆمـەڵـی شێخـە سـۆڵ
چـاوە نـوارِی کـردنـەوەیـە
بـۆ دیـدارێ
لـە روخسـاری رووی نـازدارێ
نیـوە شـەوە و
کـۆڵـی خـەیـاڵ
پـەرِ و باڵیـان دەرهێنـاوە
هیـچ نـازانـم
چیـم لێـدەکـەن
بلێـی نـەمـدەن بـە گێـژاوی
ئـەم لێشـاوە
نیـوە شـەوە و چـاوە نـوارِی
لـە جێـگادا کپـی کـردووم
پێـت وا نیـە ئـەو شـەوە
هـەر ئـەو شـەوە بـێ

کـە دەمێکـە
بـە نـاوبانگـی درێ مـردووم !

- «سولەیمان کاوە» -

## بەسە

پێـم مـەڵـێ بـەس بگـری " بـاوەڵـێ[1] " گـریـانـی بـەسـە
قـرچـە و بـرژە و کـپـەی دڵـی بـریـانـی بـەسـە

پیـرەکـەم ! ماتـەمـە بـۆت ئێستـە هـەمـوو کـوردستـان
نـەك بلێـن کـۆچـی تـۆ هـەر داخـی مـوکـوریـانـی بـەسـە

بـە خـەزانـی خـەمـی تـۆ بـاخـی ئـەدەب ژاکـاوە
بـەس هـەنـاسـەی سـرِی شێعـری وەکـوو زریـانـی بـەسـە

١ ـ خەڵك بە مامۆستا سەید کامیلیان کوتوە " باوەڵێ "

نادر نیروومەند «بۆران»



تێبینی : لەپڕکردنەوەی ئەم جەدوەلە داخەسوو ئوسوولی کوردی بە پێی رێنووسی هەڵبــژێردراوی ئەم کوواره رەچاو کراوەجکە لەوەی نیشانــەی ( ۷ ) دانەنراوە. واتائەکەر بۆوێنە وشەی ( شڕ،کۆڵ ،زۆر، شێر،و٠٠) ی تێدابێ بەشکڵی ( شر،کول ،زور، شیرو٠٠٠ ) دەنووسرێ ٠



۱ ـ زانایەکی بە ناوبانگی کورد لــە وڵاتـــی سۆڤیەت دا ـ دڕوو ۲ ـ هەڵم و بوخار ـ ئەڵقــە ریـــز ۳ ـ عەشیرەتێکی بە ناوبانگی موکریان ـ مـــــڵانــە ۴ ـ خودای جوولەکان ـ ژمارەیەکە ـ باش و چاك بە کوردی شیمالی ۵ ـ بە شمشیر کایە دەکا ـ قوت ـ کــەسێــك ئەوەی زۆر بێ سەرکەوتنی زۆرتر دەبێ ۶ ـ پێـــوە نووساندن ـ خۆرە تاو ـ شاخـە ۷ ـ ئاواش هەر "یا "یە ـ دژی خاڵی ـ دەنـــکــــی مــــــــار ۸ ـ فەسڵــی سارد و سەرما ـ دژی نێر ۹ ـ شکڵ و شێوە ـ کیــــان لەبەرێکی کەوڵ بە قیمەت ـ ناوی کیایەکی کوێستانــی بۆن خۆش ۱۰ ـ بەفری زۆر کە لە جێکایەك کۆ بێتەوە ـ قەپاڵ ـ بەردێکی گران و بە قیمەت ۱۱ ـ ئامرازێکـــی وەزن کردن ـ ئافەتی دەغڵ و دان ـ " چا " بە ئینگلیسی ۱۲ ـ هێلکە بە کوردی شیمال ـ هۆ ـ " نیـــرە " ی تێکەڵ ۱۳ ـ دڕندە ـ سەرکەردان ـ دارێکی کونداره لە سەر بەرداش دادەبەسترێ ۱۴ ـ دەنکی گوللە ـ نێوێکی ژنانە ـ دەنکی کریانــی بە سپا ۱۵ ـ خودا تۆڵەی لــە بزنــی شاخدار دەکاتـەوە ـ ئامرازی رێزمـــــانـی هەڵبــژاردن ـ هەزار کرەم

۱ ـ بەشێك لە کوردستانی سووریا ـ گیانداریکـــی ئازی و وشکانی ـ ورچی عەرەبی بە رێنووسی کوردی ! ۲ ـ ناوکاری ـ فرێــزوو ۳ ـ سەلە ـ لق و پۆپی دارە بێ ـ دژی پیـاو ! ۴ ـ کوێنی بێ ریشە ۱ ـ شاخێکی بەرزە لە کوردستانـی عێراق ۵ ـ ئامرازی دار بـڕیـــن ـ نادیـار ـ ژمارەی تەنیـا ۶ ـ دۆست ـ لای خوارەوەی چا لاوـ یا هەر شتێك کە قووڵ بێ ـ میوەیەکی شیرین و سپی ـ پرژ و پەرێشان ۷ ـ دەچاوی دەکێشن ـ پێ ـ دژی پێش ـ لا ـ بەرگ و پۆشاك ۸ ـ مەیل و ئیشتیا ـ بێچووی باڵندە کە هێشتـــا تووکی لێ نەهاتووە ۹ ـ رووناك ـ بازاری قەدیمی بە تاق و کومبەز ۱۰ ـ پاڵەوانی کەورەی شانامە ـ بەتاڵ نیـــە ٠ ۱۱ ـ خۆراکری و ئازایەتی ـ نیوە مستێك ـ پێتەختی ئۆتریش ۱۲ ـ ساقو نیە ـ پیتێکی دووپات ـ کاکڵ ـ ۱۳ ـ چـــەرخ هەیەتی ـ سەمبولی رەشی و تاریکی ـ دژی بەرز و بڵێنــد ۱۴ ـ کێوێکی بەرزە لە رۆژاوای شنۆ ـ گیاندارێکی گەردن درێژە ـ زەلام ـ ۱۵ ـ کــومان ـ شاری ئاوە ـ قەڵای مێردانە



**پڕکراوەی جەدوەلی ژمارە ۴۸**

**بەرەندەی جەدوەلی ژمارە ۴۶**

**خوشکەکو لاڵە خالیدی لەمەهاباد**



# رەخنە ل سەر فەرهەنگا

## «هەنبانە بۆرینە»

■ «خالد عەبدورەحمان»

... هەبوونا هەر فەرهەنگەکا کوردی ، ڤێجا چ (کوردی - کوردی ) یان ژی (کوردی - هەر زمانەکی دن) بە ، دسەر کێماسی و شاشی یێن وێ را کارەك گەلەك باش و پیرۆزە . چونکی فەرهەنگ بژ ل ژ وێ چەندێ کو زمانی ژ گەفا ئێلی کرنێ دپارێزە ، دبە شەنگستەك موکوم و خورت ژی ژ بۆ پێشڤەچوون و وەرارا وی زمانی .

**فەرهەنگ :**

- جی یەکی ئێمنە بۆ پەیڤان ، دناڤ خودا دحەوینە ، ناهێلە هندابین و ژناڤ چوونێ دپارێزە ، بژل ژ ڤان هەموویان فەرهەنگ شەنگستەك موکومە بۆ رێزمان و زانستێ هەر زمانەکی ژی . ئانکو بژ ل ژ کۆم کرنا پەیڤان ، دڤێ رێ و ئاوایێن رێزمان ، چەوانییا وەرار و پێشڤەچوون و زانستێ وی زمانی ژی ب رەنگەك ئەکادیمی تێدا بن . پەیڤ ژ هەڤ بێن جودا کرن و ڤاڤارتن، بێن شروڤە کرن ، کۆکا وان بێ دەست نیشان کرن .

زمان زان یان باشتر بێژین پەیڤ زانێن زمانێ کوردی دوارێ زانستێ فەرهەنگان داژی مفا هەبوویە و هنگاڤێن باش رانانە . لێ هەتا نهۆ فەرهەنگێن وان ژ ئالیێ زانستێ فەرهەنگان ڤە کێماسی و شاشی تێدانە ، ئەڤ وێ چەندێ ناگەهینە کو ئالی یێن باش ژی تێدا نەبن و کێم زێدە خزمەتا زمان و رێزمانا زمانێ مە نەکربن .

هەر وەك مە پێشتر گۆتی ، فەرهەنگان ڤێجا کێماسی و شاشی یێن وان چ بن ؟ کارەك گەلەك باشە، نەخاسم بۆ زمانێت وەکوو یێ مە . داکوو بین شەنگستەك موکوم ، بین ژێدەرێن دولەمەند بۆ فەرهەنگێن باشتر ، ئەکادیمی تر و زانستی تر ، کو ئەرکێ زمان و فەرهەنگ زانێن ئەکادیمی یێن مللەتی یە کو د پاشە رۆژێ دا ب دلسۆزی دەست بدن ڤی کارێ پیرۆز .

فەرهەنگێن مە دیتین ڤێجا چ (کوردی - کوردی ) بن یان ژی (کوردی - هەر زمانەکی ) دن بن ، بێ کێماسی و شاشی نەبوونە و ل لۆکا فەرهەنگێن زمانێن دن نەبوونە . یان هەر چ نەبە چەند

هنگاڤەکا پێشکەفتی تربن و خولکێ زانستی و ئەکادیمی پیڤە خویابە ! خەبتین دڤی واری دا بەردەوامە ، کاروان خورتە و رێڤینگێن وێ ب رێ ڤەنە و هەر ل ناڤبەرا چەندەکی فەرهەنگەك بەلاڤ دبە و تێ وەشاندن .

(ڤێجا ئەم بێنە سەر مەبەستا بنێشمیی ) :

**هەنبانە بۆرینە**

فەرهەنگا (کوردی - فارسی ) - بەرگایەکێ ل داوی یا سالا ( ۱۹۸۹ ) ان دا کەتیە بەردەستێ خوەندەڤانان . من ژی مێزەکرێ و د ئاڤرەکا سەرپێ یی دا دیتنێن من ئەڤ بوون :

- ژ وێ هژمارا مەزنا پەیڤان خویایە ، یان هەر وەك دانەر د پێشگۆتنێ دا باس دکە دیارە کو دانەرێ وێ ماموستا هەژار ، گەلەك وەستیایە ... خو هەکا مەزن رشتیە ... رەنج و زەحمەتەکا مەزن دیتیە ... ئەڤ ژی کارەکە ب رۆژ و مەهان ب جی نایێ ، بەلکو کارەکە رەنج و خوە و زەحمەتا سالان دڤێ . ئەڤ ژی سەربلندی یە هەم بۆ ماموستا هەژاری دانەرێ فەرهەنگێ کو دوی ژیی - دا هوستا

دخەبتە ، هەم ژی بۆ مللەتی کو تێکۆشەرێن هۆسا هەنە و ب وی ژیییێ ب سەر و رهێن سپی ڤە ب موکومی و گەلەك ب دلسۆژی زێرەڤانی و پارێزڤانیییێ ل زمانێ وی دکن •

ـ ( هەنبانە بۆرینە ) ژ ئالییێ پەیڤان ڤە گەلەك دەولەمەندە • ئەگەر بەرگا دوییێ بێ وەشاندن وێ ببە یەکان فەرهەنگ کو هژمارەکا هند مەزن ژ پەیڤان دناڤ خودا حەواندبن •

ـ ( هەنبانە بۆرینە ) خوە ب زاراڤەکی دیار کرییێ زمانێ مەڤە گرێ نەدایە • هەر چەند زاراڤێ کورمانجیا ژێرێ ـ سۆرانی ـ شەنگستێ وێ یە ! لێ زاراڤێن دن ژ بیر نەکرنە و کێم زێدە جی یێ وان تێدا هاتیە کرن • ئەڤ ژی هنگاڤەك گەلەك باش و ب مفایە ژ بەر کو خەلکێ مە کو ب زاراڤێن جودا جودا د پەیڤن ل سەر زاراڤێن دن یێن زمانێ مە هایدار دکە ، کو سەرئەنجام و ل دووماهییێ زاراڤێن زمانێ مە نێزیکی هەڤ دکە •

( هەنبانە بۆرینە ) گەلەك پەیڤ کو هاتبوون ژ بیر کرن ، یان د نڤیساران دا بە کار نەدهاتن ، یان ژی دهزرا خوەندەڤانێ کورد دا نەبوون ، ڤەژاندن ڤە و دانانە بەرچاڤێ خۆرت و کەچێن مللەتی کو نڤیسڤان نڤیسارێن خوە پێ ب خەملینن و خوەندەڤان د خوەندنا زمانێ خودا لشت و مفایێ ژێ ببینن •

ـ ( هەنبانە بۆرینە ) هاریکارەکا باشە بۆ خۆرت و کەچێن مللەتی نەمازە بۆ ئەوانا کو زمانێ خوە باش نزانن یان دەمێ نڤیسارەکا کوردی دخوینن و ژ بەر لاوازیا وان ب زمانی باش تێ ناگەهن ••• هاریکارەکا باشە بۆ ئەوانا کو باشتر و بەفرەهتر نڤیسارێن کوردی بخوینن و تێ بگەهن •

ـ ( هەنبانە بۆرینە ) ڤالاییی یەك دناڤ کتێبخانا کوردی دا تەژی کر و دێ هێز و زاخەکا مەزن ژی بدە کاروانێ خەباتا فەرهەنگ دانانێ و دێ ببە پێ خوارنا رێڤینگێن وی کاروانی کو ل دووماهییێ و سەرئەنجام دێ کاروانێ فەرهەنگ دانانێ خورت تر ، ب لەزتر و تەکووزتر بکە •

لێ د سەر ڤان هەمی ئالی یێن باش یێن ڤێ فەرهەنگێ را مە چەند دیتنەکێن دن ژی لە سەر هەنە کو رێ ددن مە پیچەکێ ب هنباکا وێ دادن • لێ بەری باس بکین داخوازیا مە ئەوە کو تەڤ پویتەدارێن ڤی واری زەند ، باکێن خوە هلدن و شەوژی دیتنێن خوە دانن بەرچاڤ دا کوو د پاشەروژەکا نێزیك دا لشت و مفا ژێ بێ وەرگرتن بۆ فەرهەنگەکا کوردی یا مەزنتر ، باشتر ، زانستی تر و ئەکادیمی تر •

دیتنێن مە گەلەکن لێ ب نێرینا مە ژ هەمیا گرنگتر ئەڤن و دڤان خالکان دا کۆم دبن :

ل سەر بەرگا فەرهەنگێ هاتیە نڤیساندن :

**فەرهەنگی**

**کوردی ـ فارسی**

لێ ژ بەر کو ئانکوییێ پەیڤان ب کوردی ڤێجا ب فارسی دابنە ، لەورا ب مەوەرە فەرهەنگ ( کوردی ـ کوردی ـ فارسی ) یە ، نەکو ( کوردی ـ فارسی ) ئانکو دڤیا بوول سەر هاتبا نڤیساندن :

**فەرهەنگی**

**کوردی ـ کوردی ـ فارسی**

ـ دپێشگۆتنا فەرهەنگێ دا ، ددەمێ رێز کرنا فۆنیمێن زمانێ مە و لێڤ کرنا پەیڤ و وان فۆنیمان دا ، و ژبەر کو رێزمانا زمانێ مە هەتا نهۆ ب درستی نەهاتیە نڤیساندن و خەلکێ مە و یێ بیانی هند شارەزایی تێدا نینە ، لەورا باشتر بوو د پێشگۆتنا فەرهەنگێ دا ، د دەمێ رێز کرنا فۆنیمێن زمانێ مەو لێڤ کرنا پەیڤ و وان فۆنیمان دا ب کورتی باسێ ، رێزمانا زمانێ مە و بنگەهینا وێ کربا ، ئالاڤ ـ جێ ناڤ ـ ژێدەر ، ژێك ڤاڤارتبان و دابانە نیاسین ، پەیڤ ـ ئیدیوم ـ پەند ژێك ڤاڤارتبا و دابانە نیاسین ، وەرارا پەیڤێ بە تایبەتی و یا زمان و رێزمانا زمانێ مە ب گشتی بەحس کربا •

و ژ بەر کو فەرهەنگ ( کوردی ـ کوردی ـ فارسی یە ، ل هەمبەر وێ رێزمانا کوردی ، رێزمانا فارسی ژی هاتبا نڤیساندن ئەڤە وەکی هەڤبەری کرنەك ،

داكوو خوەندەڤان یان ئەوێ فەرهەنگێ ب كار تینە ژێرا ساناهی تر ببە و ب رەنگەكی باشتر تێ بگەهە • دوێ دەمێ دا دانەر بخوەژی دفەرهەنگێ دا ، د رێز كرنا پەیڤان دا هەڤتووشی گەلەك شاشی یان نەدبوو كو پاشێ ئەمێ باس كەین •

ـ د رێز كرنا فۆنیمێن زمانێ مەدا ، دانەری ب كەیفا خۆ فۆنیم راكرنە ، دیارە ئەڤەژی دزمانی دانایە • زمانزان دڤێ فونیمێن زمانی دیار بكە• گە لەكی یان كێمی یا فۆنیمان ژ زمان را كێماسی نینە • فۆنیم شەنگستێ زمانی یە ، ئەگەر هات و یەك ژێ هات راكرن ئەو زمان دێ لەنگ بە و نكارە هزرێ دانیت سەر رووپەلێ و دانیت بەرچاڤێ خوەندەڤانی • هەر زمانەكی زیندی و ب گیان یاسا و دەستوور و بنگەها خوە هەیە كێماسی تێدا تونە ، دڤێ زمانزان نەپەنی یێن وان یاسا و دەستوور و بنگەهان خومیا بكە ، نەكو ژ جەم خوە دارێژە و درست بكە !!

د زمانی دا فۆنیم هۆسا تێ دەست نیشان كرن : ئەگەر هات و د بیڤا

هەر پەیڤەكی دا پیتەك هات گوهەرتن و ئانكویا وێ پەیڤێ ل گەل خوە گوهەرت ئەو پیت فۆنیمە •

دانەری :

" ی " یا دەنگدار كو د لاتینی دا " Î " یە، دەنگدارا " i " كو دتیپێن عەرەبی دا نیشان ژێرا نەهاتیە دانین ، " و " یا بێ دەنگ كو د لاتینی دا " W " یە ، " وو " یا درێژ كو د لاتینی دا " Û " یە ، " ە " یا دەنگدار كو د لاتینی دا " e " یە • هەر راكرینە •

راكرنا پێنج فۆنیمان بۆ هەر زمانەكی زیانەكا مەزنە ، وی زمانی لەنگ دكە و گەلەك درێژیێن وێ دا پەیدا دكە • ژ هەژی گۆتنێ یە كو د پێشگۆتنێ دا باسی هندەكان كریە ، لێ درێژ كرنا فۆنیمان دا نەنڤیساندنە ئانكو ب فۆنیم دانەنابنە • لەورا هەر كەسێ تەماشەی فەرهەنگێ بكە و فۆنیمێن رێز كری ببینە ، دێ وەها تێ گەهە كو فۆنیمێن زمانێ كوردی تنێ ئەون كو دانەرێ فەرهەنگا ( هەنبانە بۆرینە ) رێز كرنە •

نهۆ ئەمێ باسی وان فۆنیمان كن :

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ی - y | بێ دەنگ | یار | - | yar |
| ی - î | دەنگدار | هاڤین | - | Havîn |
| و - w | بێ دەنگ | وەرە | - | were |
| و - u | دەنگدار | گول | - | Gul |
| ۆ - o | دەنگدار قەلەو | دۆر | - | Dor |
| وو - û | دەنگدار درێژ | دوور | - | dûr |
| - i | دەنگدار | مرن | - | mirin |
| ە - e | دەنگدار | دەرەوە | - | derewe |

ل دوو پێناسا فۆنیمێ ( ك - K ) دكورمانجی یا ژووری دا دوو فۆنیمە :

ك + ار ــ كار ب ئانكویا ئیش ، شۆل
ڬ + ار ــ ڬار ب ئانكویا ڬارك ، تێشكا بزنێ
ك + ە ر ــ كەر ب ئانكویا گوهـ درێژ
ڬ + ە ر ــ ڬەر ب ئانكویا ڬەرەك ، پرتەك ، پارچەك
ك + ا ــ كا ب ئانكویا كانێ - كوانێ - نیشانا پسیاری یە •
ڬ + ا ــ ڬا ب ئانكویا ڬا و جەهـ - ئالف - خارنا تەرشی و حەیوانان •

بڤی ئاوایی ( ك - K ) ل دوو پێناسا فۆنیمێ د كورمانجی یا ژووری دا دوو فۆنیمە • دەنگێ وێ د دەمێ لێڤ كرنا پەیڤێ دا تێ گوهەرتن • لەورا دڤیا بوو هات با دەست نیشان كرن • دڤێ بێژین كو دنڤیسارێن كورمانجی یا ژووری دا ل كوردستانا ئیرانێ ژ هەڤ هاتنە جودا كرن • تەماشەی كۆڤارا ( سروە ) بكن •

ـ ( ئ - هەمزە ) د كوردی دا فۆنیم نینە •دەنگ هەیە ، لێ ل دوو پێناسا فۆنیمی نابە فۆنیم و ل هەمبەر وێ دەنگدارێن زمانێ مە ب كار تێن •

نموونە :

| رێنڤیسا عەرەبی | رێنڤیسا لاتینی |
|---|---|
| ئازاد | Azad |
| ئەز | ez |

| | |
|---|---|
| ئێك | êk |
| ئم | im |
| ئۆف | of |
| ئیجار | îcar |

- ( ع )* ژی د زمانێ مەدا فۆنیم نینە ٠ وێ ژی دەنگ هەیە ، لێ ل دوو پێناسا فۆنیمێ نابە فۆنیمەك سەر بخوە ، ل هەمبەر وێ ژی دەنگدار یان چەند پیتێن دن ب كار تینن ٠

نموونە :

| رێنڤیسا عەرەبی | رێنڤیسا لاتینی |
|---|---|
| عەرد | 'erd |
| عاسمان - عەسمان | 'asman - 'esman |
| ئیسماعیل | îsmayîl - simayîl - simahîl |
| عەور | 'ewir - hewir |
| عوسمان | Osman |
| عور | Or |

- د دەست نیشان كرنا ( بزاڤ - دەنگدار ) پێن زمانێ مەدا دانەری :

ول - وڵ - وۆڵ - وۆڵ - ور - وڕ - وۆر - وۆڕ - وۆڕ ، ب بزاڤ دانایینە ٠ تشتێ هۆسا د زمانێ مەدا تونە ٠

د زمانان دا دوو دەنگ تەڤ دبن ، لێ ژێرا نابێژن بزاڤ ، بەلكوو ئیدیۆما خوە هەیە و ژێرا دبێژن دیفتۆنگ ٠

دیفتۆنگێن زمانێ مە : وی - وێ - نگ - ند :

خوون ← خوین ← خوێن

شوون ← شوین ← شوێن

| | |
|---|---|
| دەنگ ـــ نگ<br>پەنگ ـــ نگ<br>خوێندەوار<br>تەندوور | ل هندەك دەڤەرێن كوردستانێ ( نگ ) ( ند ) لێڤ كرنا خویا تایبەت هەیە ٠ |

لەورا ب مەوەرە ( بزاڤ - دەنگدار ) ێن زمانێ مە ئەڤن :

ئا - ئی - ئێ - ئۆ - ئو - ئوو - ( i ) - ە ـە

e - i - û - u - o - e - î - a

---

* ئەم دبارا نەبووثا " عێ " د زمانێ كوردی دا دگەل نڤیسكارێ ڤێ گۆتارێ نینن ( سروە )

فۆنیمێن زمانێ مە بگشتی ئەڤن :

ئا - ب - پ - ت - ج - چ - ح - خ - غ - د - ر - ڕ - ز - ژ

س - ش - ف - ڤ - ق - ك - ڬ - گ - ل - ڵ - م - ن - و -

ه - ی - ە ـە - ئێ - ئی ( I ) - ئوو - ئۆ - ئو

A - B - D - T - C - Ç - Ĥ - X - X̂ -

D - R - R̂ - Z - J - S - Ş - F - V - Q -

K - K̂ - G - L - L̂ - M - N - W - H - Y -

e - ê - Î - İ -

Û - O - u

د فەرهەنگێ ژی دا ئانكو ل سەر پەیڤێن فەرهەنگێ دیتنین مە ئەڤن :

- دڤیا بوو ب باشی ل دوو پەیڤێ چووبا ل دوو شیانێ كۆكا وێ دەست نیشان كربا ، ڤێجا خومیا كربا كا ئەو پەیڤ چی یە ؟ كا ژێدەرە ؟ ئـا لاڤە ؟ جێ ناڤە ( جودا و پێڤە گرێدای ) ناڤە ؟ كارە ( ئاوا و دەمێ وێ ) ؟ هەڤال ناڤە و هتد .

- پێدڤی بوو ئیدیۆم و پەند ژ هەڤ هاتبان ڤاڤارتن ٠ هەژی گۆتنێ یە ل هەمبەر پەیڤێن فارسی نڤیساندیە كو ( كنایە ) یە ، لێ ل همبەر بیێن كوردی دانەنایە ٠

- فەرهەنگا ( ناڤ ) ان ،،اعلام،، ب ناڤێن جی یان و كەسان یا جودا با گەلەك باشتر بوو ٠

- گەلەك پەیڤ كو ب ئاوایێن جودا جوداتێن لێڤ كرنێ ل دوویەك رێز كرنە و هەر یەك بپەیڤەك دانی یە كو هەڤبەندی بزارا ڤێن زمانێ مەڤە هەیە ٠

دڤیا بوو پەیڤا درست و كۆك نڤیساندبا ،پاشێ گوت با هۆسا ژی تێن لێڤ كرن ٠ چەند نموونە :

| ١ | ٢ |
|---|---|
| ئەمەندە | ئەمەنە |
| ئەندازە | ئەنازە |
| بادام | باام - بایام - باوام |
| بالا دەست | بالا دەس |
| ئاخندراو | ئاخنراو |
| بەیداخ | بەیاخ |

ب مەوەرە پەیڤین هژمارە ١ پەیڤێن درست و

كۆكـن و دڤیـا بوو هـەر ئەو هاتبان رێـز كرن • ڤێجـا ل هـەمـیـمر وان گۆت با هوٚ سـاژی تێن لێڤ كـــرن و پەیڤێن هژماره ٢ نڤیسـاندبان • دەمـێ دگەهشتــه پەیڤێن ( ئەمەنه ، ئەڤازه و ••• ) ل هـەمبـــــەر نڤیـســانـدبـا تەماشەی پـەیڤێن ( ئەمەنده ، ئەنـــدازه و ••• ) بكه •

ـ گەلـەك پـەیڤ ـ هـەڤـۆك یـــــان نیـــڤ هـەڤـــۆكـن •

بـــەوەره ئەو پەیڤ نینـن و نابه ب مەرەمـــا زێدەكـرنـا پـەیڤـان بێن دانیـن و فەرهەنگ پێ بـــێ درێـژ كـــرن :

نموونـــه :

ئۆدا

ئاڤـا تـەزی

ئاڤـا بـەرف

ئاڤ ڤـەخـارن

ئەڤ شەڤــه

ئەڤشـــەو

بتخۆم

ـ برام

و گەلـەكێـــن دن •••

هـەر وەك مە گۆتی ئـەڤ نەپـەیڤن بـــــەلكـــوو هـەڤـۆكێن درســت یـان ژی نیـڤ هـەڤـۆكـن •

ئۆدا : ژ ( ئۆ + دا ) پێك هاتیه •

ئۆ ـ ئا لاڤـێ بانگ كرنـێ یـه •

دا ـ كورت كریا پەیڤا ( دایكه )

ئۆدا بانگ كرنا دایكێ یه و هـەڤـۆكـه •

١ ـ ئاڤـا تەزی

٢ ـ ئاڤـا بـەرف

٣ ـ ئاڤ ڤەخارن

ئەڤ هـەر چارەژی پەیڤ نینن • بەلكو ژ دوو پەیڤـان پێك هاتنـه •

١ ـ ئاڤ + ا + تەزی ـــ ئاڤا تەزی

٢ ـ ئاڤ + ا + بەرف ـــ ئاڤا بەرف

٣ ـ ئاڤ + ڤەخارن ـــ ئاڤ ڤەخارن

دیار دبه كو یایەكێ و دوویێ و سێیێ ژ : پەیڤـا ( ئاڤ ) + ( ا ) نیشانا ئیزافه ( اضافه ) كرنـێ و نیشانا مێ + پەیڤێن ( تەزی ، بەرف ،ڤەخارن) پێك هاتنـه • ئـەڤـەژی پـەیڤ نینـن •

یا چارێ ژی ژ دوو پەیـــڤا : ( ئاڤ + ڤەخـــارن ( ژێدەر ) پێك هاتیه ئەڤ ژی پەیڤ نینـه • و دەمـــا ئـەو پـەیـڤ یەك دكـرن ژی ح ئانكوییێن تایبـەت كـــو ژ ئانكوییێن وان هـەر دوو پـەیڤـان دوور بە نادن •

ئەگەر ئەو دوو نموونێن یەكێ ب ڤێ پێك هاتنـێ بـان ، دابـن یـەك پـەیـڤ

١ ـ تـەزیـاڤ

٢ ـ بەرفـاڤ = بـەفراڤ = بەفراو

ئەڤ شـەڤـه

ئەم شــــەو

ئەڤـەژی پـەیڤ نینن ، ئەوژی ژ دوو پەیڤان :

١ ـ ئەڤ + شـەڤ + ه

٢ ـ ئەم + شـەو      پێك هاتنـه

( ئەڤ و ئەم ) ناڤێن نیشانـێ نـه .

( شەڤ، شەو ) پەیڤن و ئانكوییێن وان دیارن .

دیسا دەما یەك دكرن ژی ئانكوییێن تایبـــەت و دوور ژ ئانكوییێن وان نادن • لەورا ئەڤ ژی پـــەیـــڤ نینـن • ئـەگـەر هۆسـا بە ئـەڤـه مرۆڤ دكاره ناڤێن نیشانـێ ل گەل هـەمی پـەیڤێن دن ب كار بینه ،هنگـێ فـەرهـەنـگ دێ گەلەك و گەلەك درێژتر به !!

١ ـ بتخۆم

٢ ـ برام

و گەلـەكێن دن

ئەڤ ژی پەیڤ نینـن بەلكوو هەڤۆكێن درستـن •

١ ـ بتخۆم ژ ( بَ + ت + خۆ + م ) پێك هاتیه •

ب : پێشگره و هـەڤبـەندی ب ( خۆ ) ڤـه هـەیـه •

ت : جێ ناڤـێ پێڤـه گرێداییه ب ئانكویا ( تـو )

خۆ : رەهێ ژێدەرێ ( خواردن ) ه

م : جێ ناڤێ پێڤـه گرێداییه ب ئانكویا ( من )

هەمی ب هـەڤرا ئانكویەكا درســـــت ددن و هـەڤـۆ كەكا درستـەژی و بڤـی ئاوایـی :

| كورمانجیـا ژێری | كورمانجیـا ژووری |
| --- | --- |
| من تـۆ بخـۆم | تـه بخـۆم |

من تۆ بخۆم ؟ — ته بخوٚم ؟
من تۆ بخۆم ! — ته بخوٚم ! -

دبینین کو هەر یەك ژ وان هەڤۆکە کە و ئانکویا خومیا تایبەت هەیە .

٢ - برام :

ئەڤ ژی هەڤۆکە و ژ : برا + م پێك هاتیە .
برا : ئانکویا وێ دیارە . ئازاد برایێ منە .
م : جێ ناڤێ پێڤە کرێدایە .

هەر دوو پێکڤە ئانکویەکا دن ددن .

| کورمانجی ژێری | کورمانجی یا ژووری |
| --- | --- |
| برای من | برایێ من |

هەر وسا ب ئانکویەکا دن ژی تێ :
برام = منیان برد = ئەز برم .

و هۆسا بۆ گەلەك پەیڤێن دن ئەگەر فەرهەنگ هۆسا هاتبان نڤیساندن ئەڤە مرۆڤ دکارە هەموو ( جێ ناڤان ) یێن هەر دوو زاراڤێن سەرەکی یێن زمانێ مە ل گەل هەموو پەیڤان دانە . هنگی ب هزاران و یگرە ب دەهان و سەدان هزار پەیڤان ژێ چێ کە !

- گەلەك پەیڤ و ئیدیۆمێن بیانی هاتینە ناڤ زمانێ مە و نهۆ گەلەك بەبەرفرەهی دنڤیسارێن کوردی دا ب کار تێن و هژمارەکا مەزن ژ خەلکێ مە تێ دگەهن . مخابن فەرهەنگێ جی یێ وان نەکریە . بۆ نموونە :

پروپاگندە : دەعایە
سوسیالست : ئیشتراکی
رۆل : دەور

و گەلەکێن دن .

دڤیا بوو جی یێ وان ژی هاتبا کرن .

- گەلەك ژ پەیڤان هەر ئانکویا وان یا کەڤن نڤیساندییە ، لێ نهۆ ئانکویەکا دن هەیە و دڤیا بوو هاتبان باس کرن . بۆ نموونە :

ئەلقە لە گوێ : نهۆ وەك ئیدیۆمەك سیاسی ب کار تێ ، ب ئانکویا ( نۆکەر و کرێ گرتی ) .
جڤات : نهۆ ب ئانکویەکا دن ئانکویەك د وارێ سیاسەتێ دا ب کار تێ ئەنجومەن ، مەجلس،جڤاتا نیشتیمانی - ئەنجومەنی نیشتیمانی ، ( مجلس وطنی ) .

- گەلەك ژ پەیڤان ئانکویین وان یان شرۆڤە کرنێن وان ب شاشی هاتنە نڤیساندن یان کێماسی تێدایە . دانەری هۆسا باسێ ڤان پەیڤێن ژێری کریە :

١ - باشوور : لای قوبلە
باکوور : پشتەو قوبلە
٢ - ئەوبەر : ڤێ رەخێ
٣ - ئاو رشتن : میز کردن
٤ - ئاوا کردن : بنیات نان - زەوی نەکێلدراو ، کێلان و چاندن
٥ - ئاورێژ : جێگەی میز کردن

١ - بۆ هەر دوو پەیڤێن ( باشوور و باکوور ) .ب مەوەرە شرۆڤە کرنا پەیڤان د فەرهەنگێ دا هۆسا نابە . باشە ئەگەر یەك ل یەمەن بە وێ چەوا بە ؟

٢ - ئەوبەر : ( وی رەخی ) نەکوو ( ڤێ رەخێ )

٢ - ئاو رشتن : ژ بلی ئەوا دانەری دانای کو میز کرنە ئانکویەکا دن ژی هەیە کارێ ئاو رشتن - دەمێ یەك ئاڤێ درێژە دڤیا بوو هاتبا باس کرن . هەر وسا وەك ( ئیدیوٚم ) ژی ب کار تێ کو ژ ڤێ پەندێ هاتیە وەرگرتن ( گەورە ئاو دەرێژن بچووك پێ لێسێ دەنێن ) .

٤ - ئاوا کردن : بنیات نان ، ئەڤە راستە.، لێ زەوی نەکێلدراو کێلان و چاندن نابە و دڤیا بوو هۆسا بە : کێلان و چاندنی زەوی نەکێلدراو - کێلان و چاندنا زەڤی یێن بەیار ئەڤە ل گەل ئانکویا فارسی ژ ی یەك دگرە ( شخم زدن و آباد کردن زمین بایر ) تو بێژی ئەڤە شاشی یا چاپێ بە ؟!

٥ - ئاورێژ : ژ بلی جی یێ میز کرنێ ، ئانکویەکا دن ژی هەیە و دوورە ژ جی یێ میز کرنێ . ئەڤ بانمیێ ئاڤ رێژە . ( شرك )

- د فەرهەنگێ دا هاتیە ( ژێ بابۆ : ئەوی بە کورمانجی قسە دەکا - ژێ یێ : کەسێك بە زاری کورمانجی داخێوێ ) . گەلەك جاران برادەرێن سۆرانی زار ژ بادینیان را دبێژن ئەو چ ( کڤە کڤە ) ! یان ئەم ژ عەرەبان را دبێژین ( یابۆ ) ل هندەك دەڤەران ژی ژێرا دبێژن ( کوڕێ عەمشایی ) ، یان عەرەب ژ کوردان را دبێژن ( کاکە ) ، ئەڤجا ( ژێ-

بابۆ ، ژیێ بیێ ) ژی هەر هوّسانە ، ب مەوەرە ئەڤ پەیڤ نینن ••• و نابە د فەرهەنگان دا بێن دانین •

ـ گەلەك پەیڤ بیانی نە و ل هەمبەر وان ب کوردی هەیە • لیّ دانەری ب پەیڤێن کوردی دانینە ، راستە زمان ژ سیّ ئاواییێن پەیڤان پێك تیّ :

١ ـ پەیڤێن تایبەت و کۆك

٢ ـ پەیڤێن چیّ کری کول گەل پێڤا ژۆکا ژیانی زمان ژان چیّ دکن و کراسیّ وی زمانی دکن بەر •

٣ ـ پەیڤێن زمانێن دەور و بەر ب تایبەتی ویێن بیانی ب گشتی •

لیّ ئەڤە ویّ چەندیّ ناگەهینە کو هەموو ئەو پەیڤێن د ئاخفتنیّ دا ب کار تێن ب پەیڤێن کوردی بێن دانین • نەخاسم بۆ زمانیّ مە کو سیّ زمانان ( عەرەبی فارسی ، ترکی ) راست و راست کار لیّ کریە •

پرانیا وان پەیڤێن بیانی کو دانەریّ فەرهەنگیّ ب پەیڤێن کوردی دانینە ب کوردی هەنە ، بەلاڤن و هەموو خەلك تیّ دگەهن • ئانکوو دڤیّ تنیّ ئەو پەیڤێن کو بەرامبەر وان ب کوردی نینن یان باشتر بێژین ئەم نزانن پەیڤێن بیانی ژێرا دانین • دانەری ئەڤ پەیڤێن ژێری د فەرهەنگا خوەدا رێز کرنە و ب پەیڤێن کوردی دانینە : ( آباد ـ آبدار ـ ئەرجو ـ ئومی ـ ئەسلحە ـ ئوستاد ـ " امتحان ، شتیحام " جمال ) و گەلەکێن دن • ئەڤە د دەمەکی دا کو مە پەیڤ بەرامبەر وان هەنە و هەموو خەلك ژی دزانە ئەوژی ئەڤن :

( " ئاوا ، ئاڤا " ـ چایچی ـ ( هێڤی دکەم، هێڤی دارم ، هیوا دارم ، تکایە ، لاڤ دکەم ) ـ ( نەخوەندەڤان ، نەخوێندەوار ) ـ چەك ـ ( ماموّستا ) ـ تاقی کرنەوە ـ ( جوانی ، رندی ، قەشەنگی ، شەنگی ، شۆخی ، شەپالی ، خوشینکی ) • ئیجا بۆ چی ئەو پەیڤێن بیانی ب پەیڤێن کوردی بێن دانین ؟

هەر د پەیڤێن بیانی دا ، هندەك ب ئاوایێن جودا جودا تێن لێڤ کرن ، وی هەموو نڤیساندنە و هەر یەك ژی ب پەیڤەك دانی یە • نموونە :

باعس : ( باعث ) ا عەرەبی یە •

دانەریّ فەرهەنگیّ ( باعیس ـ بایس ، بایست ، بایستی ) دانینە •

ب مە وەرە هەموو یەك پەیڤە ئەوژی (باعث ) ە• لەورا دڤیا بوو تنیّ ( باعس ) نڤیساندبا و گوّت با ئەڤە پەیڤەك عەرەبی یە و ئانکویا ویّ دابا ڤیّجا گۆتبا هوّسا ژی تیّ لێڤ کرن ئەوێن دن نڤیساندبان •

ـ پێدڤی بوو هاتبا خوویا کرن کا ئەو پەیڤ ج زاراڤە ؟ داکوو ئەویّ تەماشەی فەرهەنگیّ دکە و پەیڤەکا نوو دبینە ژیّ پشت راست ببە کو ئەڤە پەیڤەك درستە و ل فلان دەڤەریّ یان بێڤان زاراڤیّ ب کار تیّ • ئەگەر ژ بەر ویّ چەندیّ بە کو ب حسێب د عەرەبی دا نابێژن ئەڤ پەیڤ ئێراقی یان سووری یە ، ئەڤە ئەم دیّ بێژین عەرەبا زمانیّ خوەیی یەك گرتی هەیە و مەنینە • دیسا دیّ بێژن ئەگەر ژ بەر ویّ چەندیّ بە یان هەر وەك دانەر بخوە دبێژە دا کو کوردی دەولەمەند ببە ، باشە بۆ چی ل هەمبەر پەیڤان ئانکویین وان ب کورمانجی یا ژووری یان ب زاراڤێن دن نەنڤیساندنە ؟

ـ هەر وەك مە بەری نهۆ گۆتی هەر چەند کورمانجی یا ژێری شەنگستیّ فەرهەنگیّ یە لیّ گێم زێدە جی بیّ زاراڤێن دن ژی هاتیە کرن •

ل سەر کورمانجی یا ژووری کو یەك ژ هەر دوو زاراڤێن شەنگستی و سەرەکی‌یێن زمانیّ مەیە، دڤیا بوو باشتر گرنگی پیّ هاتبادان ، پەیڤێن کورمانجی پتر تێدا بانیان ل هەمبەر پەیڤان ئانکوییێت وان کورمانجی ژی نڤیساندبان ، ب پێدڤی دزانین کو هندەك ل سەر پەیڤێن کورمانجی بپەیڤین •

گەلەك پەیڤین کورمانجی یا ژووری کو گەلەك بلاڤن تێدا نینن • بۆ نموونە : جفتە ـ ئاڤر ـ جنیك ـ پارزنین ـ جەلال ـ جڤیك ـ سەدەم ـ سەکڤان ـ جڤاك ـ تیتك و گەلەکێن دن •

گەلەك ژ پەیڤان ئانکوویین وان ب کورمانجی یا ژوورینەدانینە ، وەك : ( بروّ ـ بستە بالا ـ بە ـ پوور ـ تابلۆ ـ ترۆکان ـ چەقی ) و هتد • کو ئانکو یێن وان ب کورمانجی یا ژووری ئەڤن : ( هەرە ـ ببە ژن بوهست ـ ب ـ مەت ـ کەڤال ـ نقاندن ـ چکلی ) و هتد •

لێڤ کرنا گەلەك پەیڤێن کورمانجیا زۆری شاشی

تیێدایە وەك :

( ئاخافتن ـ زیرەڤان ـ ) ب مە وەرە راستی یا لیڤ کرنا وان هوسایە : ( ئاخفتن ـ زیرەڤان )

لڤر ئەو چەندە ژی ل بەرچاڤ هاتیە دانین کو ژ دەڤەرەکی بۆ دەڤەرەکا دن لێڤ کرنا وان جودایی تیێدایە ٠

ئانکویا هندەك پەیڤێن کورمانجی یا ژۆری ب شاشی هاتیە دان یان چەند ئانکو هەنە هەموو نەهاتنە نڤیساندن یان ژی ئانکوییێن وان ب کورمانجی یا ژۆری داینە شاشی تیێدایە ٠ دانەرێ ( فەرهەنگا بۆرینە ) هۆسا باسێ ڤان پەیڤێن ژێری کریە :

١ ـ ئاراندن : ئێشاندن

٢ ـ بەردەڤك : نۆکەری هاوریێی سەفەر و بەردەست ، وێژەر لە باتی ئاغا

٣ ـ بەرکرن : لە بەر کردن بۆ دەرس و ٠٠٠

٤ ـ ئاریشە : دژوار ، چەتوونی ، زەحمەت

٥ ـ زیێرەڤان : ئێشك گر

٦ ـ ژبەرهەڤ : بەرانبەر بە یەك

٧ ـ پارێزڤان : بیستانەوان

٨ ـ تیێرەڤان : زانا

ب مەوەرە ڤان پەیڤان شاشی تیێدایە و بڤی ئاوایی یە :

١ ـ ئاراندن : راستە ئێشاندنە ، لێ ئیشاندنەك تایبەتە و وەك هارالێ تێ ٠ روژاندن

٢ ـ بەردەڤك : ژ بلی وان ئانکوییێت ژێرا هاتین دان ، وێ چەندێ ژی دگەهینە دەمایەك دپەیڤە و یەکی دن ئاخڤتنا وی دبرە و ل بەر دەڤێ وی ددە ٠ هەر وسان بەردەڤك بۆ وێ خاڤك و دەستمالێ دبێژن کو ژنك ژ شەرما ددنە بەردەڤێ خۆ ٠

٣ ـ بەر کرن : ژ بلی لەبەر کردنی دەرس و ٠٠٠ وێ ئانکوییێ ژی ددە ، دەما یەك جلکەکی ل بەر خوە دکە ٠

٤ ـ ئاریشە : ژ بلی ئانکوییێن ژێرا هاتین دانین ـ گرفتاری ـ گیرو گرفت ژی دگەهینە ٠ هەر وسان ئانکوویا وی یادن شلووغی و بزۆزی و نەحەجمانە ٠

٥ ـ زیێرەڤان : ئێشك گر نینە ، بەلکو ( مراقب )ە ٠ ئێشك گر و ( مراقب ) ئانکوییێن وان گەلەك ژێك دوورن ٠

٦ ـ ژ بەرهەڤ : بەرامبەر یەك نینە ، بەلکوو بەرهەڤ : ئامادە ، بەرهەڤ کرن ، ئامادە کرن ژ بەرهەڤ : لە ئامادە

٧ ـ پارێزڤان : ژ بل بیستانە وانی یێ ئەڤێ ئانکوویی ژی ددە ٠

پارێزڤان : پارێزەر ـ ئەوێ تشتەکی دپارێزە ٠ وەك پارێزڤانێن گەل وو لاتی ، پارێزەرانی گەل و ولات

٨ ـ تۆرەڤان : زانا نینە ، بەلکوو ( وێژەوان )ە ٠ ئەدیب ل داویێ دێ بێژم ، هێڤیدارم ئەز کاری بم رۆناهیەکی بێخنم سەر فەرهەنگا ( هەنبانە بۆرینە ) و دانەرێ وێ ژی ب دلەك مەزن و بەرفرەه وەرگرە و ل چاپێن بێن لشت و مفایێ ژێ ببینە ٠ هەر وسا هێڤیدارم کو پویتەدارێن دن ژی زەند و باسکا هلدەن و ئەوژی دیتنێن خوە دانن بەرچاڤ ٠٠٠ ژ بۆ فەرهەنگەکا کوردی یا باشتر ، مەزنتر ، ئەکادیمی و زانستی تر مە هەبە ٠








**ئیختاری یە:** نامەیەکی رەسمی یە لە لایەن دادگاوە بۆکەسێك یا کەسانێك دەنێردرێ ولەونامەیەدا شتێك وەبیرکەسێك دێننەوە یا ئەمری پێدەکەن بۆ ئەنجام دانی کارێك.

**باکردن:** هەڵمسان - توورە بوون (بای کردووە: قەڵس بووە).

**بەرژەوەند:** مەسڵەحەت.

**پاپۆر:** کەشتی (کەشتی گەورە ی دەریایی کە بەئاگر بڕوا).

**پووشکەڵ و وشکەڵ:** پووش وپەلاش.

**تالاو:** ژەهراو - مەبەست لەقسەی ناشیرنە.

**جیغی بەنەفش:** ئاشێرمیە بە شێعرێکی هووشەنگی ئێرانی شاعیری هاوچەرخ کەزەمانێك دەنگە دەنگێکی زۆری لێ سازبوو.

**خۆ خواردنەوە:** پیش خواردنەوە.

**خۆهەژاندن:** خۆراژاندن.

**خاست:** ویست( خواست)

**دەمامك:** ماسك - نیقاب

**دیتران:** ئەوانی تر- خەڵکی دیکە (دیگران).

**رۆژی بەرین:** رۆژی ئەزەل.

**رالەخۆبوون:** لەخۆرازی بوون - بە خۆفشین.

**راهاتن:** عادەت بەشتێك گرتن - خووگرتن.

**زایە:** (ضایع) - بەزایە دان: زایە کردن.

**ژاوەژاو:** دەنگە دەنگی زۆر وتێکەڵ پێکەڵ.

**قڕان تێکەوتن:** لەبەین چوون بە تەواوی - ما ڵات قڕانی تێکەوت یانی هەمووی قڕبوو ،هەمووی فەوتا .

**کارامە:** لێهاتوو.

**کڕی:** ماتی - بێدەنگی.

**کۆڵ کردن:** شوشتنی شت وەك - جلك شوردن.

**کەی دەکەم ئێستای دەکەم:** مەبەست ئەوەیە کە هەرئێستای دەکەم،ئێستا باشترین کاتە بۆ کردنی ئەوکارە.

**گورگە لۆقە:** (چەشنێك رۆیشتنە) - رۆیشتن بە هەنگاوی کورت بەلام بەخێرایی - وەك گورگە لۆق هاویشتن.

**گاس کردن:** هەراکردن - بانگ کردن.

**لێکوتە:** زەربە

**ناتەبا:** ( ناسازگار - نالێك - پێکەوە نەگونجاو.

**هەمبەر:** بەرانبەر

**هەشتاو:** کەسێکە کە پەلە بکا لە کارێکدا - بەهەشتاو : بەپەلە.

**یەك بە خۆ:** بەهەمووتواناوە- بە تەواوی هێزەوە .





هێرۆ وەیسی - شنۆ





تەوەحودی - مەشهەد



مەحمەد حەسەن زادە- تەورێز



سەدیق مونەقی - سنە